# بڕیار

102

لە پێناو گەلێکی خاوەن بڕیاردا



ساڵی نۆیەم
کانونی یەکەم ٢٠١٦

یەکەمین گۆڤاری کارگێڕیو گەشەپێدانی مرۆیی لە کوردستاندا

مانگانەیەکی تایبەتە بە کارگێڕیو گەشەپێدانی مرۆیی



## تا لە ژیاندا ماوی!

## لە ڕوانینت بڕوانە!

## ئایا دەتوانیت ساڵانە ٥٠ کتێب بخوێنیەوە؟

## ئایا تۆ لە شوێنکارێکی گونجاودایت؟



دیدارێک لەگەڵ بەڕێوەبەری پڕۆژەی شاری مامۆستایانی سلێمانی م . عەتا شێخ کەریم

**خاوەنی ئیمتیاز**

د. مەسعوود تـاهیر ڕۆژبەیانی

**سەرنووسەر**

د. عادل محەممەد شێخانی

sarnosar@yahoo.com

**بەڕێوەبەری نووسین**

بەرزان ئەبوبەکر

**دەستەی نووسەران**

ئەسکەندەر ڕەحیم

بێگـەرد فــارس

زاهـیــر زانــا

محەممەد مێرگەیی

محەممەد هاشم

وەهـاب حەسـیب

یەحیـا محەممەد

**دیزاین**

پشتیوان عبدالرحمن

**تایپ**

کەلسووم جەلال

**ڕاوێژکاری یاسایی**

پارێزەر: ئازاد محێدین

No : 102

کانونی یەکەم

2016

**ناونیشانی گۆڤار**

سلێمانی: گەڕەکی باخان- شەقامی بۆتان- خانووی ژمارە ٧٤ تەنیشت
باخچەی بەکر صدقی، بەرامبەر کینگ سپۆرت

٠٧٤٨٠١١٢٧٨٧ - ٠٧٧٠٢١٧٨٦٨٢

هەولێر: ٠٧٥٠٤٤٦٣٢٣٠

bryarmagazine

bryarmagazin@gmail.com

bryarmagazine

چاپ: پیرەمێرد

دابەشکردن: پەیك/ 07708649210

نرخ: 2500 دینار

# بڕیار

**مانگانەیەکی تایبەتە بە کارگێڕیو گەشەپێدانی مرۆیی**

**ساڵی نۆیەم - ژمارە 102 - کانوونی یەکەم 2016**

# کارگێڕیو بازاڕسازی















یەکەم دڵۆپ
سەرنووسەر



# تا لە ژیاندا ماوی!

هەرچەندە بژیو تەمەنت درێژ بێ، هێشتا ژیان زۆر کورتەو خـۆری تەمەن کاتێك ئاوا دەبێت، ئیدی جارێکی دی، بە دیداری شاد نابیتەوە!

تەمـەن ئەگەر هەمووی خۆشـیو ڕابواردن بێـت؛ ئەوا هەر کورتەو کۆتایی هەر داخو حەسرەتە!وەکوو نالی دەڵێت:

هەرچەنـدە کـە عومـری خضـرو جامـی جەمـت بـوو
چونکـە ئەمەلـت زۆرە، چ عومرێکـی کەمـت بـوو

ئیدی بۆچی بە دەسـتی خۆمان، ژیـان بکەینە دۆزەخو ئەم چەند ڕۆژە کورتەی تەمەن، بە ئازارو دەردیسەری بەسەر بەرین؟!

هـاوکات بۆچـی بهێڵیـن مـەرگ کۆتایی بە هەموو شـتێك بهێنێت؟

بۆچی خۆمان ڕازاوەترین ژیان بەسەر نەبەینو دوای خۆشمان باشـترین شوێنەوار بەجێ نەهێڵینو چرای کردارە جوانەکانمان، لە دوای خۆمان هەر داگیرساو نەبێتو گۆڕەکەشمان بۆ ڕووناك نەکاتەوە؟!

ئەمـڕۆ لە هەموو کات باشـترە؛ تـا تیایدا شـێوازی ژیانو ئامانجی ژیانو پرۆژەکانی ژیانت، هەڵبژێری.

چەند خۆشە بەسەربەرزی بژی، بەنەمری بمری!!

نەك خۆشت نەزانی، خەریکی چیتو چی دەکەیت!

بۆ نایەیت بۆ چەند ساتێك بەیەکەوە کار بۆ ئەوە بکەین، کە ژیان چۆن بەسـەر بەرینو پێش ماڵاوایی لەم دنیایە چی کارێك ئەنجام بدەین؟!

لەبەرئـەوەی تەمەن دیاریکراوەو ئەم کارەش لە دەسـەڵاتی ئێمە بەدەرە؛ پێویستە پلانو کاری ئێمەش دیاریکراو بێت..

مـن بۆ خـۆم، ئەم پرۆژانەم دیاری کردووە، پێشـم خۆشـە ئێوەی بەڕێزیش هاوڕێم بن، ئێوەش سوودمەند بن.

*بخوێنـەرەوە ئەگـەر هـەر کارێـك دەکەیت، پیشـەکەت هەرچۆنێکـە، کاتت کەمە، یا زۆر، بخوێنـەرەوەو هاوڕێی کتێب بە، ئەگەر ڕۆژی یەك ڕستەش بخوێنیتەوە! دڵنیا بە بەم کارەت، زۆر ئاسـوودە دەبیت، جیهانێکی ئەفسووناوی، بۆ خۆت درووست دەکەیتو لە سـەختترین سـاتەکانی ژیانتـدا، وەك هێلانەیەکی هێمن، ڕۆحت تیایدا ئارام دەگرێت.

* ئـەو کارە بکـە، کـە پێت خۆشـە، پیشـەیەك مەکە بە سـەرچاوەی زیندەگیت کە ئارەزووت لێ نییە، هەمیشە ئەو کارە ئەنجـام بدە، کە خۆت دەتەوێتو پێی ئاسـوودەیتو لێی ڕازیت، خۆ ئەگەر بتوانی پرۆژەی تایبەتت هەبێتو بەسـەربەخۆیی کار بکەیت؛ ئەوا کارێکی گرنگە.

*ژیانـی خۆت ڕێك بخـەو نەریتە خراپەکانـت بگۆڕەو لە جێگایان خووی جوان دابنێ.

* مەبە بە هاودەمو خۆشەویسـتی دەستەلەملانی خەمو زۆر دنیـا مەدە بـە کۆڵتداو هەرهیـز ڕقت لە خـۆتو ژیانی خۆت نەبێتەوە.

لە کۆتاییدا، هەموو ئەو شـتانە جـێ دێڵیت کە خۆتی پێوە خەریك دەکەیتو لە پێناویدا بڕستت لێ بڕاوە!

*خۆت پاشـای ژیانی خۆت بەو هەرگیز مەبە بە سـەربازی کـەس! هەڵبژاردەکانت خۆت دیاری بکە، لاسـایی کەس مەکەوەو خۆت خۆت بەو بەو شێوەیە هەنگاو بنێ، کە خۆت دەتەوێت.

* لە ژیاندا، پێویسـتت بە هـاوڕێو هاودەمی باشو گونجاو هەیـە، زۆر بەوردی هاوڕێکانت هەڵبژێرەو بزانە کێ دەکەیت بە هاودەمو هاوڕێی ڕێت.

دڵنیـا بـە ئـەو هاوڕێیانـەی بە شـێوەیەکی بـاش هەڵیان دەبژێـریو متمانەیـان پێ دەکەیت؛ هاوکارێکی باشو پشـتێکی بەهێز دەبن بۆ تۆ.

بۆ هەوڵ نادەی لە خودی خۆتدا دەزگایەکی خێرخوازی بیت، ڕۆژانـە بڕێکی کـەم پارە دیاری بکەی، بەو پارەیەت فرمێسـکی منداڵێکی بێباوك بسڕیت، خەمی هەژارێك بڕەوێنیتەوە، دەرمانی دەردەدارێك دابین بکەیت، شادمانی ببەخشیت بە دڵە شکاوەکان؛ تا لـە ڕۆژێکدا کارە خێرخوازییەکانت فریـات بکەون، کە کەس فریات ناکەوێت!

لـە کۆتاییدا پێت دەڵێم: ئەگەر هەسـتت بـە نامۆیی کرد؛ نیگـەران مەبـە، بەڵکـوو ڕێز لـەو نامۆییە بگـرە؛ چونکە تۆ جیاوازیت لە ملیۆنەها کەس، کە ژیانێکی دووبارە بەسەر دەبەن.

تۆ خاوەنی ئامانجو پلانو بەرنامەو بڕیاری خۆتیت!

# کارگێڕی بە گوفتار

ئەو کاتەی ئاوی کانیاوەکان وشکی کرد،
ئەو کات نرخی ئاو دەزانین

پەندێکی ئەفغانی

دونیاو ئاخیرەت وەکوو خۆرهەڵاتو خۆرئاوا وان، کەی
دوورکەوتیتەوە لە یەکێکیان، لەوی تریان نزیك دەکەویتەوە، هاوکات
کەی لە یەکێکیان نزیك کەوتیتەوە، لەوی دیکەیان دوور دەکەویتەوە.

پەیامبەر عیسا سەلامی خوای لێ بێت

ئەو کەسەی گوێی بە ڕەقیی جێگەی
نووستنەکەی نەدا؛ بەباشی دەخەوێت.

پەندێکی دانیمارکی

لە ناخی هەر مرۆڤێکدا، دادگایەکی دادپەروەر
هەیە، کە هەمیشە یاساکانی لە دەروونماندا
بێدارن، ئەو دادگایەش ویژدانە!

پەندێکی ڕووسی

ئەو کەسەی بە دادپەروەری کار بکات،
پێویستی بە ئازایەتی نییە!

هێنری جیمس



# پزیشکێکی زیرەک!

جارێك پزیشکێك سەردانی نەخۆشێك دەکات، نەخۆشەکە هێندە هەژار دەبێت، کە پزیشکەکە زۆر بەزەیی پیدا دێتەوەو زۆر خەفەت لە هەژاریو بارودۆخی خراپی نەخۆشەکە دەخوات.

لەبەرئەوە نەك هەر پارەی لێ وەرنەگرتن، بەڵکوو دراوێکی خستە ناو ڕەچەتەکەو بۆی بەجێ هێشتن.

دوای چەند ڕۆژێك، پزیشکەکە کەسوکاری نەخۆشەکەی بینیو پێی گوتن: إن شاء الله ئەو پارمەتییەی کە بۆم بەجێ هیشتن، شوێنی خۆی گرتووەو سوودی خۆی هەبووە؟

ئەوانیش لە وەڵامدا گوتیان: بەڵێ قوربان، خودا پاداشتی خێرت بداتەوە، بەو پارەیەی جەنابت، پزیشکێکی باشمان بۆ هێنا!

**لەم چیرۆکەوە فێر دەبین:**

١.چاکەکردن تەنها بە پارەوپووڵ ناکرێت، بەڵکوو ئەنجامدانی ئەرکی خۆمان باشترین چاکەیە.

٢. پزیشکەکە ئەگەر کاری خۆی بەجوانی ئەنجام بدایە؛ لە بەخشنی ئەو پارەیە باشتر بوو.

٣. بەزەییهاتنەوەو فرمێسکرشتن بە تەنها، بەس نییە بۆ هەژاران، بەڵکوو دەبێت چارەسەرو ڕێگاچارەیان نیشان بدەین.

٤. ئەوان پزیشکەکەیان بۆ چارەسەری نەخۆشییەکەیان بردبوو، نەك بۆ چارەسەری هەژاری.

٥. ئەگەر هەرکەسێك لە ئێمە هەوڵ بدات لە ڕێگای پیشەو پسپۆڕییەکەیەوە خزمەت بکات؛ ئەوا بە تێچوویەکی کەم، دەتوانین خزمەتی گەورە بکەین.

٦. با کاتێك کە خێرو چاکەمان کرد، باسی نەکەینو بە چاوی بەرامبەریدا نەدەینەوە؛ تا پاداشتی خودایی لەدەست نەدەین!

# تەنها بۆ سەرکردەکان

بولبول وێڕای بێهێزو لاوازیو بچووکی، پاڵەوانی سەربەستییە؛ چونکە ماڵاوایی لە هیچ قەفەسێك ناکات؛ یان لە خەمو پەژارەدا گیانی دەردەچێت، یاخود لە بێهیواییدا خۆی دەکوژێت!

وەلیەدین یەکون

سەربەستیو ئازادی بەبێ یاسا، جگە لە زریانێکی وێرانکەر، هیچی دی نییە.

ج.ب. سای

ئازادیو بەرپرسیارێتی دووانەن، ئەگەر یەکێکیان لەوی دیکەیان جیا بکەیتەوە، هەردووکیان دەمرن.

ئەندریە مۆروا

* بەئازادی لە برسێتیدا بمریت، باشترە لەوەی بەتێری لە کۆیلەییدا بمریت!

پەندێکی ئینگلیزی

من سەرسامم بەو کەسەی وا گومان دەبات، ژیان شتێکەو ئازادیش شتێکی دیکە، ئەو کەسە نایەوێت قەناعەت بکات، بەوەی کە ئازادی یەکەم نرخدانەری ژیانە، ژیانیش نابێت بەبێ ئازادی.

ئەحمەد لوتفی سەیید



# دیدارێك لەگەڵ بەڕێوەبەری پڕۆژەی شاری مامۆستایان لە سلێمانی

م . عەتا شێخ کەریم

بەڕێوەبەری پڕۆژەی شاری مامۆستایان لە سلێمانی، کە لەلایەن گرووپی کۆمپانیاکانی ڕەسەنەوە جێبەجێ دەکرێت.

پـرۆژەی شـاری مامۆسـتایان وەك وەفـاو خزمەتێـك بۆ ئەو مامۆستا بەڕێزانەی بۆ یەکەم جار دەستیان گرتینو قەڵەمیان دایە دەستمان، ساڵی ٢٠٠٩ لەلایەن بەڕێز ئەندازیار: مەسعوود تاهیرەوە، پێشکەش بە ئەنجوومەنی وەزیران کرا بۆ مامۆسـتایانی هەر سێ پارێزگاکەی کوردستان "هەولێر، سلێمانی، دهۆك"

دوای ڕەزامەندیی ئەنجوومەنی وەزیران، سـاڵی ".٢٠٠٩" دەسـت بە پرۆژەی شـاری مامۆسـتایانی هەولێر کرا، ئەم ساڵو لە مانگی ""٢٠١٦/١٠"ەوە دەسـت بە ڕادەسـتکردنی یەکەکانی کـراو پرۆژەکە تەواو بوو، هەردوو پرۆژەی شاری مامۆستایانی سلێمانیو دهۆکیش لە بواری جێبەجێکردندان.

شـایانی باسـە: گرووپـی کۆمپانیاکانـی ڕەسـەن، یەکەمیـن کۆمپانیایـە، کـە پرۆژەیەکی تایبەت بە مامۆسـتایانی پێشـکەش کـردووەو ویسـتوویەتی وەکوو سوپاسـێکی کەمو بـە تێچوویەکی گونجاو، خزمەتێك بە مامۆستایان بکاتو لانەیەك بۆ نیشتەجێبوونی مامۆستایان دابین بکات.

لەم بارودۆخە سەختەشـدا، کە زۆربەی پرۆژەکان ڕاوەسـتاون، "ڕەسـەن" کارەکانـی ڕانەگرتـووەو هەوڵی داوەو هـەوڵ دەدات بە هەموو شێوەیەکو چی لە توانایدایە هاوکاری مامۆستایان بکات.

لـە ژمارەی داهاتوودا، زانیاریی تەواو، لەسـەر پرۆژەی شـاری مامۆستایانی هەولێر پێشکەش دەکەین.

بڕیار: بەڕێـز.م . عەتـا شـێخ کەریـم ، بەڕێزتـان وەک بەڕێوەبەری پرۆژەی شاری مامۆستایان لە سلێمانی ، ئەم پرۆژەیە لە چی پێك هاتووە؟

م .عەتا شـێخ کەریم: پرۆژەی شاری مامۆستایان لە سلێمانی، پێـك هاتووە لە (١٩٨٠) یەکەی نیشـتەجێ بوون، کە خۆی لەنێو (٣٠) باڵەخانـەی (١١) نهۆمـی دەبینێتەوە لەسـەر ڕووبەری (٨٨) دۆنـم زەوی، کـە شـارەوانیی سـلێمانی زەوییەکەی بـۆ تەرخان کـردووەو کەوتۆتـە ڕۆژهەڵاتـی سـلێمانییەوە، پرۆژەکـە هەموو کارە خزمەتگوزارییـەکان لەخـۆ دەگرێـت: لە قوتابخانە، باخچە، نـەخۆشخانە، مزگەوت، دایەنگا، باخچەی ساوایانو چەند مارکێتێك کە بەشـێوەیەکی سـەردەمیانە دیزاین کـراون، ڕووبەری یەکەکان (١٠٠م٢)و بەبێ جیاوازی سەرجەمیان، یەك نەخشەیان هەیە.

بڕیار: ئەم پرۆژەیە تەنها ئامانجی دەسکەوتی (داراییە)، یان ئاسانکاریو خزمەتە بە توێژی مامۆستایان؟

م .عەتا شـێخ کەریـم: بەڵـێ، بێگومان هەمـوو پرۆژەیەك، وەبەرهێنـان بێت، یا بازرگانی، یا هـەر کارێکی تر، ئامانج تێیدا دەسـکەوتی داراییـە، بەڵام ئـەم پرۆژەیە ئەگەر سـەیری نرخی یەکەکانـی بکەیـت؛ دەزانیـت کە دەسـکەوتی داراییـی تێیدا زۆر سـنووردارە بەراورد بە پرۆژەکانی تر، ئـەوەی بەدی دەکرێت لەم پرۆژەیە، نرخ تێیدا کەمە، هەروەها بە کوالیتییەکی باش درووست دەکرێـتو پێمان وایە تـا ڕادەیـەك توانیومانـە لای خۆمانەوە، خزمەتێك بە مامۆستایانی بەڕێز بکەین.

بڕیار: چ ئاسـانکارییەك بۆ مامۆسـتایان کراوە؛ تا مامۆستایان بتوانـن لـەم بارودۆخـە سـەختەدا، ببـن بـە خاوەنـی یەکەی نیشتەجێبوونی خۆیان؟

م .عەتـا شـێخ کەریم: سـەرەتا هەر لە دیاریکردنی شـێوازی پارەدانەوەدا، ئاسانکاری بەرچاومان کردووە.

دیاریکردنـی ( ١٠٠,٠٠٠) $ وەك پێشـەکی کـە بەشـداربووان دەبوایە بە یەك جار پارەکەیـان بدایە، بەڵام کردمان بە چوار جارو لە نۆ مانگدا.

ئـەوەش نەتوانرا، ماوەی ئەو پێشـەکییەمان درێژ کردەوە بۆ (١٥) مانـگ، ئـەوەش کاری کۆمپانیای زۆر قـورس کرد هەرچەندە نەمانهێشت هیچ کاریگەری لەسەر بەڕێوەچوونی کارکردن هەبێت، لە ئێستادا کاتی وەرگرتنی قیستی مانگانە دەستی پێ کردووەو دیارە دۆخی دارایی بەشـداربووان بەهۆی کەمیـی مووچەو دواکەوتنی، جارێکـی تر ئەو بڕە پارەیـەی دیاریمان کردبوو کە (٤٠٠$) بوو، کردمان بە (٣٠٠$) تا ئەوکاتەی دۆخی دارایی باش دەبێت.

بڕیار: تا ئێستا پرۆژەکە لە سەدا چەندی جێبەجێ کراوە؟

م .عەتـا شـێخ کەریم: پرۆژەکە لە ئێسـتادا، کە نزیکەی (١٤) مانگـە دەسـتی پێکـردووە، ( ٤١ ٪ )ی، تـەواو بووە ئـەم ڕێژەیە بەبەراود بە ماوەی ڕۆشـتوو، لەگەڵ ئـەو پارەیەی کۆمپانیا وەری گرتوە، زۆر زیاترە .

بڕیار: ئەی ڕۆڵی یەکێتیی مامۆسـتایانو کەسانی پەیوەندیدار چی بووە لە سەرکەوتنی پرۆژەکەدا؟

م .عەتا شـێخ کەریم: بەڕاسـتی زۆر جێگای دەستخۆشـین بەڕێـزان لـە لقی سـلێمانی یەکێتیـی مامۆسـتایان، هەروەها سـکرتاریەتی یەکێتیـی مامۆسـتایان زۆر هاوکارمـان بـوون لـە بەڕێوەچوونـی کارەکان، کـە بـەر دەوام هاوکارمـان بـوون بۆ ڕاییکردنـی کارەکان لە لایەنـە پەیوەندیدارەکان، دیارە سـەرەتای کارەکان لـە سـاڵی (٢٠١٣) دەسـتمان پـێ کرد، ڕوتینیاتی وەرگرتنی مۆڵـەت بۆ پرۆژەکە، کاتێکی زۆری پێویسـت بـوو، بەڵام توانیمان بە هاوکاری بەڕێزان لە لقی سـلێمانی بـە تایبەتی سـەرۆکی لقو جێگری لق، هەروەها ئەو لیژنەیەی کە دیاری کرابوون بۆ چاودێریو ڕێکخستنی ناوی بەشداربووەکان.

بڕیار: لە ئێستادا زۆربەی پرۆژەکان وەستاون، یا زۆر بەسستی ئیشی تێدا دەکرێت؟ ئایە پرۆژەی شاری مامۆستایان ترسی وەستان، یاخود خاوبوونەوەی لێ ناکرێت.

م .عەتا شێخ کەریم: وەك پێشتر وتم، ڕێژەی ئیشکردنمان لە ئێسـتادا لە (٤١٪)ـە، تا ئێسـتا توانیومانە بـە شێوەیەکی زۆرباش کار بکەین.

پێـم وایـە ئەوەی قورس بوو بۆ بەشـداربووەکان، پێشـەکی یەکەم بوو، ئەگەر بەشـداربووان بتوانن ئەو ڕێژەی قیسـتەی کە دیاریمـان کـردووە، کـە (٣٠٠ $) مانگانە لە کاتی خۆیدا بیدەن، بەهیچ شێوەیەك کارکردنمان سست نابێتو ناوەستێت.

### ٨. وا بکە شوێنی فێربوون ئارامبەخش بێت

پۆلێکی خوێندن بێت، یان جێیەکی بچووك بێت بۆ ڕاهێنان، دەبێت ئەوە بۆ ڕاهێنراو بڕەخسێنێت، کە ئاگای لە هەموو شتانە بێت کە ڕوو دەدەن.. نەك بەس لەسەر کورسییەکی ڕەقوتەق دابنیشێتو خۆی ماندوو بکات؛ تا لەناو ژاوەژاوی بێزارکەردا، گوێ هەڵبخات، سا بەڵکوو شتێك ببستێت.. جا ئەگەر ڕاهێنراوەکەت، لە ڕووی جەستەییەوە ئاسوودە نەبێت؛ ناتوانێت سەرنجی ڕابکێشێت.

### ٩. گەرموگوڕ بە

ئەگەر چوستوچالاكو گەرموگوڕ بوویت بۆ مەشقو ڕاهێنان؛ ئەوا ڕاهێنراویش، وەکوو گەرموگوڕ دەبێت.

گەرموگوڕی وەکوو نەخۆشیی درم وایە، بەهۆی پەیوەندییەوە دەگوێزرێتەوە.. لە بەرامبەریشدا خەمساردیو دڕێغیکردن هەیە، کە هەر سەر بۆ ساردوسڕیو کەمتەرخەمی دەکێشێت.

### ١٠. باش خۆت ئامادە بکە

دڵنیا بە لەوەی کە زۆر بەباشی ئەو شتە دەزانی، کە دەتەوێت بە ڕاهێنراوی بڵێیت. بۆ نموونە:

*ئایا دەتەوێت کارمەندەکە فێری سیستەمی ژمێریاری، یان بەس چۆنێتی تۆمارکردنی ژمارەکان لە دەفتەری بەرپرسەکەیدا بکەیت؟

* ئەندازەی زانیاریی ئێستەی ڕاهێنراو چەندە؟

* توانای وەرگرتنی لە هەر وانەیەکدا چەندە؟ (مێشك تا ئەو کاتە توانای وەرگرتنی هەیە، کە ڕاهێنراو حەز بە دانیشتن بکاتو توانای قاڵیو قووڵیو تەرکیزی هەبێت.

* بەپێی ڕیزبەندیی ژیرانەو گونجاو، زانیارییە چروپڕەکان دابنێ.

* پێش هەر دانیشتنێك، خۆت تاقی بکەرەوە، بە لای کەمەوە زانیارییەکان لە زەینی خۆتدا، یان لە بەردەم کەسێکی دیکەدا بخەرە ڕوو.

* پێش دەستپێکردنی ڕاهێنان، لە بوونی سەرجەم ئامێرو مادە پێویستەکان دڵنیا بە، بۆ خۆیشت جێگەکە ئامادە بکە.

* لە گۆشەنیگای ڕاهێنراوەوە، نەك لە گۆشەنیگای خۆتەوە وەك ڕاهێنەر، چاو بە مادەی ڕاهێنانو زانیارییەکاندا بگێڕەوە.

### ١١. ئەو کاتەی ڕۆژی دیاریکراو دێت:

* با لە ڕاهێنراو ئاسوودەو ئەرخەیان بێت؛ چونکە کەسی شپرزە، هیچ شتێك فێر نابێت.

* بەشێنەیی بابەتە ڕوونو شرۆڤە بکە، بیهێنە بەر چاوت، چەندە بارودۆخەکە مایەی شڵەژانە، کاتێك دەست بە ڕاهێنان دەکەیتو تۆش هەر لەسەر هەمان کارامەیی خۆتیتو هیچ نەگۆڕاویت.

* توندەمیزاج مەبە؛ چونکە توندەمیزاجی وانەکەت دەشێوێنێت.

* با یەکەم جار ڕاهێنراو، لەگەڵ تۆدا تاقیکردنەوەکە بکات، لە جاری دووەمیشدا، با بەبێ تۆ، ئەزموونی بکات.

* بە مادیو مەعنەوی، هانی ڕاهێنراو بدە.

* دەمودەست هەڵەکان ڕاست بکەرەوە، چاوەڕێی تەواوبوونی هەموو هەنگاوەکانی ڕاهێنراو مەکە.. کاردانەوەی خێرا، پرۆسەی فێربوون تۆکمەو پتەو دەکات

* سەرسامیی خۆت دەرببڕە، فیزو قسەڕەقو دڵڕەق مەبە؛ چونکە مرۆڤ لە کاتو ساتی فێربووندا، زۆر هەستیارە.

* کاتی تەواو بە ڕاهێنراو بدەل تا ڕاهێنان بکات، با بۆ خۆی پەی بەوە ببات، کەی پێویستی بە یارمەتیدانە.

* چاودێریی شێوازی بەئەنجامگەیاندنی ڕاهێنراو بکە، لەوەش دڵنیا بە، کە پەنا بۆ شێوازو نەریتە هەڵەکان نابات.

## بنەماکانی فێربوون

بەشی سێیەمو کۆتایی



# گەیشتن بە ئامانجەکانمان

هەژار سەعید

بۆ گەیشتن بە هیواو ئامانجەکانمان، پێویستە لە کاتی بیرکردنەوە لە ئامانجەکانماندا، ڕەچاوی هەندێك شتی گرنگ بکەین؛ تا نزیك بێت لە ڕاستییەوەو تەنها خەیاڵو بیرکردنەوە نەبێت.. سەرکەوتنو گەیشتن بە ئامانجەکانمان، هاوشێوەی خولێکی بەردەوامو دووبارەیە هەتا ئێمە لە ژیاندا بمێنین، هەرگیز چاوەڕێی ئەوە مەکە، ڕۆژێك بێت کە دابنیشیتو بڵێیت ئیدی تەواو، هەموو ئامانجەکانم بەدەست هێنا، ئیدی هیچی دیم ناوێت، لە ڕاستیدا ئەمە هەرگیز ڕوو نادات.. (بیڵ گەیتس) لە کارکردن نەوەستا، کاتێك بوو بە دەوڵەمەندترین کەس، بەڵکوو بەردەوام بوو لە کارکردنو بەدەستهێنانی ئامانجی تر، بە هەمان شێوە هەر کەسێکی تر، کە ئێستا تۆ بە خەیاڵتدا بێت؛ چونکە سەرکەوتن، کردارێکی دووبارەو هەنگاوانی بەردەوامە.

کەواتە: پێویستە بزانین قۆناغەکانی خولی سەرکەوتن چین؟

١. دیاریکراو بێت: بۆ نموونە: مەڵێ دەمەوێت دەوڵەمەند بم، هەتا نەزانیت دەوڵەمەندی لای تۆ چییە؟ یان نەزانی چەندە پارەت هەبێت، خۆت بە دەوڵەمەند دەزانیت؟ ئەمەش بۆ ئەوەیە کە بزانیت. کەی دەگەیت بە ئامانجەکەت.

٢. نزیك بێت لە ڕاستییەوە: پێویستە بڕە پارەیەك بڵێیت، کە بتوانرێت بەدەست بهێنرێتو نزیك بێت لە ڕاستیی ژیانی خۆتەوە، هەتا تەنها وەهمێك نەبێتو بەس، بەڵکوو ببێت بە ڕاستیو بەدەست بهێنرێت.

«خۆشترین شت لە ژیاندا، ئەوەیە کە شتێك بەدەست بهێنیت، خەڵکی دەیانوت: مەحاڵە»

٣. دانانی کات بۆ گەیشتن بە ئامانجەکەت: جیاوازیی گەورەی نێوان ئامانجو خەیاڵ، ئەوەیە کە دەبێت ئامانجەکانمان، کاتێکی بۆ دابنرێ کە پێی دەگەین، ڕاستە ئامانجەکانمان لە سەرەتادا تەنها خەیاڵن، بەڵام بۆئەوەی لە چوارچێوەی خەیاڵ دەربچن، پێویستە ڕەچاوی کات بکەین، کاتیش -بەپێی ئەو ئامانجەی خۆت- تەنها خۆت دەتوانیت دیاری بکەیت.

«هەیە خەو بە سەرکەوتنەوە دەبینێت، هەیە زوو لە خەو هەڵدەستێت بۆ بەدەستهێنانی»

٤. وابەستەبوون بە ئامانجەکەتەوە: پێویستە ئامانجەکەی خۆتت خۆش بوێتو هەمیشە لەبیرت بێتو هەست بەو کاتە بکەیت، کە تێیدا دەگەیت بە ئامانجەکەت، سووریش بیت لە گەیشتن بە ئامانجەکەتو کۆڵ نەدەیت. ئەمەش وا دەکات لە پێناو گەیشتن پێی، بەردەوام هەوڵ بدەیت. لەبیرت بێت داواکردنی یارمەتی لە خودای گەورەش، کاریگەریی باشی دەبێت.

٥. کۆکردنەوەی زانیاری: وا باشترە هەموو شتێك لەبارەی ئامانجەکەتەوە بزانیتو پرسیار لەو کەسانە بکەیت، کە زانیارییان سەبارەت بە ئامانجەکەی تۆ لایەو چۆن توانیویانە بگەن بەو ئامانجەیانو ئەو کێشەو نارەحەتییانەی ڕووبەڕوویان بووەتەوە لە گەیشتن بەو ئامانجە...لەکاتی کۆکردنەوەی زانیاریدا، باشترین شت کە درکی پێ دەکرێت، ئەوەیە دەزانیت ئایا ئەمە تەنها خەیاڵە، یاخود ڕاستی

٦. دانانی پلان: دوای ئەوەی کە ئامانجێکت بۆ خۆت داناو زانیاریی تەواوت لەبارەی ئامانجەکەتەوە زانیو کاتت بۆ دانا، پێویستە پلانێکی تۆکمەشی بۆ دابنێیت؛ چونکە هەندێجار ئامانجی گەورە، بۆ خۆمان دادەنێین، بەڵام ناتوانین پێی بگەین. بۆیە هەر زوو نائومێد دەبین، بۆ چارەسەری ئەوەش، پێویستە ئەو پلانەی کە دای دەنێین بە جۆرێك بێت، کە لەگەڵ کاروبارەکانی تری ژیانی ڕۆژانەماندا بگونجێت، هەموو شەوێك پێش نووستن، پرسیار لە خۆت بکە: ئایا کاری پێویستت کردووە بۆ نزیکبوونەوە لە ئامانجەکەت؟

٧. فێربوون لە ئەنجامی کۆتاییەوە: دوای ئەوەی ئەمانەت کرد، ئەنجامەکەی چی بوو؟ گەیشتن بەو شتەی کە هەوڵت بۆ دەدا، هەروەها کۆکردنەوەی زانیاریی نوێو شارەزایی لەو بوارەدا، کە ئەمەش سەروەتێکی گەورەیە بۆ ژیانت، دڵنیا بە ئەگەر بە ئامانجەکەشت نەگەیت؛ ئەوا کۆمەڵێك ڕێگاو شێوازی نوێ فێر بوویت، کە جارێکی تر دووبارەی ناکەیتەوە؛ چونکە لە سەرەتاوە وتمان: ئەمە خولە، هەتا لەژیاندا بیت، پێویستە هەوڵ بدەیت؛ بۆئەوەی بە ئامانجەکانت. بگەیت.






**بازاڕسازیی کۆمەڵایەتی چییە؟**

لە کاتێکدا خەڵکو هاوڵاتیان ئاشـنان بە بازاڕسازیی بازرگانیو لە گەڵیدا ڕاهاتوون، بازاڕسازیی کۆمەڵایەتی جیایە لە بازاڕسازیی بازرگانی. ئامانجی بازاڕسـازیی کۆمەڵایەتـی دانانی کاریگەرییە لەسەر خەڵکی بەئامانجکراو، یان دەستنیشانکراو، بەشێوەیەك بە پلەی یەکەم، ئەم کاریگەرییە بەسـوودی کۆمەڵگا، یان هاوڵاتیان تەواو ببێت، نەك سوودو کەڵکی کڕیار. زۆربەی کات ئامانجەکانی بازاڕسـازیی کۆمەڵایەتـی دیاریکـراونو لـە شـێوەی کەڵکـی کۆمەڵایەتییـدا دەردەکـەون، دیاردەکە زیاتر لـەو ڕێکخراوانەدا ڕەنـگ دەداتەوە، کە ئامانجیان قازانجکردن نییە، بەڵکوو سـوود گەیاندنە بە هاوڵاتیان وەك: ڕێکخراوی خاچو مانگی ناو دەوڵەتی، یان ئەو ڕێکخراوانەی کە بنەمای ئیشەکانیان پاڵپشتی چالاکییەکە بەدەرە لە دەستهاتی مادی، یان دەستکەوتی بازرگانی، بۆ نموونە ئـەو بەرنامە خێرخوازییانەی کە لە کەناڵە جیاوازەکانی دەنگو ڕەنگەکاندا پێشـان دەدرێن، ئەو هەوڵانە سەرباری ئاوڕدانەوە لە کەسانی خاوەن پێداویستی تایبەت، هاوکات هەستێکی مرۆدۆستانە لە ناو بینەراندا بڵاو دەکاتەوە.

بازاڕسازیی کۆمەڵایەتی ئەو بازاڕسازییە کە پلان، ئامانجو کارەکانی لە شێوەی بنەمایەك، یان بیرۆکەیەکدا دەخاتە ڕوو، کەواتە: ئامانج لە بازاڕسـازیی کۆمەڵایەتی بڵاوکردنـەوەی بەهاو بنەمای بەکەڵکە لە کۆمەڵگادا. بەڕای شـارەزایانی بازاڕسازی، ئەم جۆرە بازاڕسازییە جوانترینو باشترین جۆری بازاڕسـازییە؛ چونکی وێنەیەکی باشی کۆمپانیاکە لە هزری کڕیاردا پیشان دەدات، بەشێوەیەك کە هۆکاری پشتگیریو خۆشەویستیی کڕیارە بۆ کۆمپانیاکە.

**Company Image وێنەی هزری چییە؟**

وێنەیەکـە کۆمپانیاکە شـێوەیەکی باشـی بەرهەمەکانی، یان کارەکانـی لە هزری کڕیـاردا دەخوڵقێنێت، بـۆ نموونە: ئەگەر پرسـیار لـە باشـترین جۆری چـا بکرێـت؟ بەخێرایـی وەڵام دەدەینەوەو دەڵێین: باشترین جۆری چا چای (Lipton)ە.

پیشـاندانی ئـەو وێنە جوانـە، توانای بەشـی بازاڕسـازیی کۆمپانیاکـە پیشـان دەدات، ئەگەرچـی دەیـان کۆمپانیای دیکە دەهێنرێت، ڕاسـتەوخۆ خۆشـگوزەرانیو Lipton بەناوو جۆری بەرهەمەکانیانـەوە شـانازی دەکـەن، بەڵام کاتێـك ناوی چێژی جوانمـان بە بیردێتەوە، بەتایبەت کاتێـك کۆمەڵێك لاوی بەژن زارف لـە کەنار دەریـا، یان نووسـینگەیەکدا دەخۆنـەوە. چای Lipton دەبینیین

چینی خانـەدانو دەیەوێت بـاوەڕ بە بەکاربەرانـی بهێنێت، کـە کڕیارانی داهاتـووی، یان بە ئامانجگیـراوی چای Lipton دەسرۆیشتووانە، لێرەوە بۆمان ڕوون دەبێتەوە، کە هەمیشەکڕیار بە گوێرەی وێنەی هزری مامەڵە لەتەك بەرهەمەکاندا دەکات.

**مێژووی بازاڕسازیی کۆمەڵایەتی:** ئەم بازاڕسازییە مێژووەکەی دەگەڕێتەوە بۆ سـاڵی (١٩٧٠)، لەسەر دەستی Philip Kotlerو Gerald Zelman هاتەکایـەوە، لـە کاتێکـدا فرۆشـیار پلان دادەڕێژێـت بۆ ئـەوان، باوەڕیان وابـوو بەرهـەمو دابینکردنی خزمەتگوزارییەکانـی هاوکات بیرۆکـەو بنەما، بەهاو ڕەفتاریش دەفرۆشێت. فرۆشتنی ساڵی (١٩٧١)، Philip Kotler لە گۆڤاری بازاڕسـازیدا ڕاپۆرتێکی بە ناونیشانی (بازاڕسازیی کۆمەڵایەتیی) ەوە نووسی بەشێوەیەکی فەرمی چەمکی بازاڕسازیی کۆمەڵایەتی ناسـێندرا. لەو کاتـەوە Philip Kotlerو Gerald Zelman بەرسـتەیەك پێناسـەی بازاڕسـازیی کۆمەڵایەتییـان کـردووە: بازاڕسازیی کۆمەڵایەتـی تەنهـا بەدیهێنانـی کەڵـك نییـە بۆ کڕیاران، بەڵکوو بە شێوەیەکی تایبەت سوودگەیاندنە بە کەسانی بەئامانجگیراوو کۆمەڵگا.

**گرنگترین چالاکییەکانی بازاڕسازیی کۆمەڵایەتی:**

زۆربەی وڵاتانی جیهان لە ڕێگای ڕاگەیاندنەوە هاوڵاتیان بەئاگا دەهێنەوەو لـە زیانو کاریگەرێکانی شـەرابو خواردنەوەی، یان کێشـانی جگەرەو زیانەکانـی، یاخود دوورکەوتنەوە لە تیشکی گەرمیی هەتاو بە هیوای پاراسـتنی جەسـتەیان لە شێرپەنجەی پێسـت. ئەوی جێـگای بیرهێنانەوەیە هەندێك لـە کۆمپانیاکان نیگەرانـن بەم بانگـەوازو هەڵایانە؛ چونکی بەمەترسـی دەزانن بۆ سـەر بەرهەمو خزمەتگوزارییەکانیان. بۆئەوەی بازاڕسـازیی کۆمەڵایەتـی سـەرکەوتوو بێـت؛ پێویسـتە شـوێن پلانگەلێك بکەوێـت، کە لـە هەوڵـی گۆڕینی ڕەفتـاری بـە کاربەراندایە، بێگومـان ئـەو کارەش بەردەوامیو پیادەکردنی ئـەو بانگەوازو هەڵایانـەی بۆماوەیەکـی زۆر پێویسـتە. ئـەو ڕێکخراوانەی کە شێوازی بازاڕسازیی کۆمەڵایەتی لە کارەکانیاندا جێبەجێ دەکەن، لە بواری پارەدارکردندا پشـت بە پیاوانی کارو لایەنی پەیوەندار لەناو حکوومەتدا دەبەستن.



# بڕیار

**گۆڤاری بڕیار، یەکەمین گۆڤاری کارگێڕیو گەشەپێدانی مرۆیی لە کوردستاندا**

**ئامادەیە بۆ دیزاینکردنو چاپکردنی هەموو جۆرە بڵاو کراوەیەک، لە دەرەوەو ناوەوەی کوردستان.....**

**بە کواڵیتییەکی زۆربەرزو بەپێی خواستی ئێوەی بەڕێز.**

**(کتێب، گۆڤار، بڵاوکراوە، ساڵنامە)**



**ناونیشانی گۆڤار**

**سلێمانی:** گەڕەکی باخان- شەقامی بۆتان- خانووی ژمارە ٧٤ تەنیشت باخچەی بەکر صدقی، بەرامبەر کینگ سپۆرت

٠٧٧٠٢١٧٨٦٨٢ - ٠٧٤٨٠١١٢٧٨٧ **هەولێر:** ٠٧٥٠٤٤٦٣٢٣٠

bryarmagazine sarnosar@yahoo.com bryarmagazin@gmail.com bryarmagazine



## نهێنییەکانی سەرکەوتن لە بازاڕسازیی ڕایەڵەدا

### نێتۆرك ماركێتینگ

### سەرکەوتن، یان شکست لە ۹۰ ڕۆژی یەکەمدا

# ستراتیژەکانی پێکهێنانی کۆمەڵەو جیاکەرەوەکانیان

و: نانا هەورامی

بۆئـــەوەی کە لە NM ســـەرکەوتوو بیت، پێویســـتە هەموو تایبەتمەندییەکانـــی بونیادنـــەران لـــە خۆتدا پـــەرە پێ بدەیت. لەکاتێکدا کە خۆت ئەو تایبەتمەندییانەت تێدا هەبێت، پێویستە بیانگوازیتەوە بۆ کۆمەڵەکەشـــت. ئەمانە لە ڕاســـتیدا هەمان ئەو پایانەی سەرکەوتنی تۆن لە NM.لە هەر بازرگانییەکی NM، ئەم تایبەتمەندییانە دیاریکەری سەرکەوتن، یان شکستی تاك دەبن:

١. پێویستە خۆت بەکارهێنەری بەرهەمەکان بیت

پێویستە بەرهەمی کۆمپانیاکەی خۆت بناسیت، پێشت خۆش بێت کە بەکاریان بهێنیت.

٢. لیستی ئەو کەســـانەی کە ئەندامن لە گرووپەکەتدا زیادو زیاتر بکە.

هەمیشـــە لیستەکەی خۆت زیاتر بکەو کەسانی نوێی بۆ زیاد بکە.

٣. دوابـــەدوای یـــەکو بە بەرنامـــە، کارەکە بە کەســـانی تر بناسێنە.

گەشەی کۆمەڵەکەی خۆت بەستراوە بە ژمارەی کۆبوونەوەکانی ناساندنی کار. هەوڵ بدە لەگەڵ بەرنامەو خێرایی زۆردا، ژمارەی کۆبوونەوەکان زیاد بکەیت.

٤. لە هەموو چالاکییەکاندا بەشداری بکە

پێویســـتە لە هەموو دانیشتن، ســـیمینارو کۆبوونەوەکاندا کە لـــە لایەن باڵادەســـتەکانتەوە بەڕێوە دەبرێن، بەشـــداری بکەیت. ســـەرکەوتنی تـــۆ بـــەوەوە بەســـتراوەتەوە، کە چەنـــد کەس لە کۆمەڵەکەی تۆ لەم گرووپانەدا بەشدارییان هەیە.

٥. ڕۆژانـــە ماوەیـــەك تایبـــەت بکە بـــە گەشـــەو کامڵبوونی کەسەکان

کتێـــب، کاســـێتو ســـیدی زۆر لە بەردەســـتدان بۆ گەشـــەو کامڵبوونی کەسەکان. سوود وەرگرتن لەم شتە بگۆڕە بۆ بەرنامەی ڕۆژانە. باڵادەســـتەکانت لەوانەیە پێشـــنیارگەلی باشیان هەبێت. خۆت لەگەڵ سیســـتمی بەردەست، لە ڕووی زەینییەوە پێش بخە. وتـــراوە: پێـــوەری ســـەرکەوتنت لە NM بەندە بە پێشـــکەوتن‌و کرانـــەوەی زهنی تـــۆ. ڕۆژانە لانی کەم ١٥ خولـــەك بخوێنەرەوە. هەرکاتێکیش خەریکی شـــۆفێریت، یان لە ترافیکدا وەســـتاویت،

گوێ لە کاسێت، یان سیدییەکە بگرە.

٦. فێربوون قەبوڵ بکە

پێویستە حەزت بە فێربوون هەبێت.NM بۆ تۆ دیاردەیەکی نوێیە، لەبەرئەوە تا ئەو جێگایەی کە دەتوانیت لە باڵادەستەکانت زانیاری وەربگرە. لە باڵادەستە سەرکەوتووەکانتو سیستمی بەردەست پەیڕەوی بکەو لە خۆتەوە شێوازی نوێ پێشنیار نەکەیت.

٧. بەرپرسیارێتی قەبوڵ بکە

NM بازرگانییەکە پشتی بەستووە بە پەیوەندیو متمانە.تۆ پێویستە بەرپرسی سەرکەوتن، یان شکستی خۆت بیت. پێویستە ڕاستگۆو درووستکار بە. ڕاستگۆیانە ئەوەی کە لە دڵتدایە، بیهێنیتە سەر زمان. کاتێك کە لەگەڵ کەسێکدا کە بڕیارە بانگهێشتی بکەیت بۆ کارەکە، یان لەگەڵ بەردەستێکتدا بەڵێن دەدەیت کە لە کاتژمێر ٨ی شەو ببیینیت، سەرەتا دڵنیا بە کە ئایا دەتوانیت لەکاتی دیاریکراودا ئامادەبیت، یان نا.

٨. کۆمەڵەکە بخەرە ژێر چاودێریو پێداچوونەوە

ئەگەرچی پێشتر ئەم بابەتەم باس کردبوو، بەڵام بەهۆی گرنگییەکەیەوە دیسانەوە بە بیرتی دەخەمەوە.

٩. پەیڕەوی لە سیستمەکە بکە

بۆ سەرکەوتن پێویستە "چاودێری تەواو" بیت. باڵادەستەکانت سیستمێك فێربوونو بەکاری دەهێنن، کە کاریگەرە. ئەوەی کە پێویستە ئەنجامی بدەیت، تەنها پەیڕەویکردنە لە سیستمەکە؛ تا بگوازرێتەوە بۆ بەردەستییەکانت.

NM بازرگانییەکە، پشتی بەستووە بە پەیوەندیو متمانە. ئەمانە بنەماگەلێکی گرنگن، کە دەتوانرێت بە سوودوەرگرتن لێیان، بازرگانییەکی سالمو ماوەدرێژ بونیاد بنرێت.

مومکینەکان

١. لەگەڵ بەردەستەکانتدا پەیوەندییەکی باشت هەبێت

بەردەستەکانت هەرچەند مەوداشیان هەبێت لەگەڵتدا، دیسانەوە بەشێکن لە کۆمەڵەکەی تۆ.

٢. بەردەستەکانت فێربکە کە سەربەخۆ بن

هەتا ئەوان سەربەخۆییەکی زیاتریان هەبێت، خێراتر گەشە دەکەنو کارەکەی تۆ ئاسانتر دەبێت.

٣. هەمیشە دوای هەر یەکتربینینێك، کاتی یەکتربینینی داهاتوو دیاری بکە.

ئەم بابەتە هەم لە بەدواداچوونو هەم لە کاتی کاردا بپارێزە.

٤. هەمیشە بە شێوەیەکی پۆزەتیف ڕەفتار بکەو قسەی پۆزەتیف بەسەر زارتدا بهێنە.

هیچ کاتێك لەلای بەردەستەکانتدا بێ مەیلی خۆت نیشان مەدە. تەنانەت ئەگەر کارەکانیش بەباشی بەرەو پێش نارۆن، ئامەزرۆییو شەوقی خۆت دەربخە.

٥. لەگەڵ باڵادەستەکانتدا ڕاوێژ بکە

پەیوەندی باشی خۆت لەگەڵ ئەواندا بەردەوامی پێ بدە؛ هەتا ئەوانیش بەردەوامی بە چاودێریی خۆیان بدەن. بەردەوام ڕاوێژیان لەگەڵدا بکە؛ هەتا هەنگاوەکانی پێشکەوتنی تۆ ببینن‌و لەم بازرگانییەدا یارمەتیت بدەن. فیکرەو ڕەخنە نوێیەکان قەبوڵ بکە.

نامومکینەکان

١. هیچ کات ڕێگە نەدەیت، کە بابەتە نێگەتیفەکان دزە بکەن بۆ خوارەوە

NM بازرگانییەکە پشی بەستووە بە هاوشێوەسازی. بەردەستەکانت پێویستییان بە چاودێریو هاندانی تۆ هەیە. هیچ کات لەبارەی بابەتە نێگەتیفەکانەوە قسە لەگەڵ ئەواندا مەکە. لە لای ئەوان گلەییو شکایەت لە کۆمپانیا، باڵادەستەکان، بەردەستەکانو شتەکانی تریش مەکە. ئەم کارە وەك ئەوە وایە، کە ئەوان هان بدە، بۆ کارێکی خراپ. کاتێك کە بابەتە نێگەتیفەکان دزە بکەن بۆ ناو کۆمەڵەکەت، وەکوو ڤایرۆس بە ناویدا بڵاودەبێتەوە. کۆمەڵەکەت لاوازو دواتر لێك هەڵدەوەشێت. نێتۆرکمارکێتەرێکی بەهێز وتوویەتی:

(ئەگەر حاڵت خراپە، بڕۆ بۆ لای باڵادەستەکان. ئەگەر زۆر حاڵت زۆر سازە بڕۆ بۆ لای بەردەستەکان."

**If you are down، go up، but you are up go" down(")**

ئامۆژگارییەکی بەنرخە! شەوقو خۆشحاڵی بدە بە خوارەوەی خۆت، دڵساردیو نەبوونی شەوقیش بە سەرەوەی خۆت.

٢. هەموو شتێکی تازە مەهێنەرە ناو سیستمەکەوە

ئەو سیستمەی کە باڵادەستەکانت پێشنیاریان کردووە، پێشتر لەبەرامبەر ئەزموونی کاتدا سەرکەوتوو بووە. هەوڵ مەدە کە گۆڕانکاری تێدا بکەیت. پێش هەرجۆرە هەنگاوێك بۆ هێنانە ناوەوەی شتێکی نوێ بۆناو سیستمەکە، دەبێت لەگەڵ پێشەنگەکانتدا ڕاوێژ بکەیت.

٣. لەبارەی سەربەشەیەکانی بەرهەم، دەرامەتی کۆمپانیاو تایبەتمەندییەکانی تری بازرگانییەکەتەوە، زیادڕۆیی مەکە. هەمیشەو لە هەموو شوێنێك حەقیقەت بڵێ.

ئێستا تۆ هەندێك لە ڕێکارەکانی کۆمەڵەسازیت لە بەردەستدایە، کە دەتوانیت بۆ سەرکەوتنی بازرگانی نێتۆرکی مارکێتینگی خۆت سوودیان لێ وەربگریت. تەنها شتێك کە دەمێنێتەوە، خودی خۆتە. دوو هەڵبژاردە لەبەردەم تۆدایە: دەتوانیت ڕێکارەکانو زانیارییەکانی ئەم زنجیرەباسە کۆ بکەیتەوەو هیچ سوودێکی لێ وەرنەگریت. لەلایەکی ترەوە دەتوانیت ئەوانەیان کە گونجاون بۆ بازرگانییەکەت بەکاریان بهێنیت. تۆو تەنها تۆ بڕیاردەریت ئەڵبەتە ئەو بڕیارەی کە دەیدەیت، گەرەنتی سەرکەوتنو ئایندەتە.



بڕیاری منداڵان

پەیام



# هەرگیز جێت ناهێڵم!

خالیدو سەردار هاوڕێی منداڵی بوون، ڕۆژانەو زۆربەی کاتەکان پێکەوە بوون، جگە لەوەی هاوپۆلی یەکتر بوونو لە قوتابخانەش لـە یەك جودا نەدەبوونەوە، زۆرێك لـە یادەوەرییەکانی ژیانیان پێکەوە بوو..

ڕۆژێکیان سـەردار نەچووبوو بـۆ قوتابخانە، خالدیش هیچ هەواڵێکـی لێی نەبوو، نەیدەزانی بۆچی نەهاتووە، ئەو ڕۆژە زۆر پەرۆشی سـەردار بوو، سـەرەتا گومانی برد، کە ڕەنگە نەخۆش بێـت، بۆیە نەهاتۆتـەوە، هەر چۆنێك بێت، ئـەو ڕۆژەش دەوام تـەواو بـوو، دوای ئەوەی گەڕایەوە ماڵو نانـی نیوەڕۆی خوارد، ڕووداوەکـەی بۆ دایکی گێڕایەوەو داوای لێ کرد، مۆڵەتی بدات؛ تا بڕوات بۆ ماڵی سـەردارو هۆکاری نەهاتنەکەی بزانێت.. دایکی مۆڵەتـی پێداو خالیدیـش بەرەو ماڵی سـەرداری هاوڕێی بەڕێ کەوت، بەڵام ماڵی سـەردار کەسـیان لە ماڵ نەبـوو، لەبەرئەوە نەیتوانی هەواڵی سـەرداری هاوڕێی دەسـت بخـات، بەخەمباری بەرەو ماڵ گەڕایەوە، لە ڕێگەدا کاتێك سـەیری ئەملاو لای خۆی دەکرد، بینی ئەوە سـەردارە، جلوبەرگـی فیتەری لەبەردایەو لە دوکانی وەسـتا حەسـانی فیتەر کار دەکات، بەپەلە ڕۆیشـت بۆ دوکانەکەی، داوای مۆڵەتی لە وەسـتا حەسان کرد، کە ڕێگە بدات کەمێك قسە لەگەڵ سەرداردا بکات.

خالد: سـەردار چـی ڕووی داوە؟ بۆچی تـۆ لێرەیت؟ بۆچی نەهاتبوویت بۆ قوتابخانە؟

سـەردار: لە ڕاسـتیدا قوتابخانە خەرجیی زۆرەو پێویستی بە زۆر کەلوپەل هەبوو؛ تا بیکڕمو بتوانم بخوێنم، تۆش باش دەزانیت لەو کاتەی باوکم ماڵاوایی لە ژیان کرد، ئێمە خاوەنی هیـچ سـەروەتو سـامانێك نەبووین، کەسـی کاسبکاریشـمان نییـە، ماڵیش پێویسـتی بە پارەو خەرجـی هەیە، منیش ئەم کارەم لێرە دۆزییەوە لای وەسـتا حەسـان کار دەکەم، تا بتوانم خەرجیو پێداویستییەکانی ماڵ بۆ دایکمو خوشکە بچکۆلەکەم دابین بکەم، پاشان ئەگەر توانیم لە ئایندەدا درێژە بە خوێندن دەدەم، بەڵام لە ئێسـتادا تاکە ڕێگەچارە ئەوەیە کە من دەبێت کار بکەم، نەك بخوێنم.

دوای ئەم گفتوگۆیە، خالد بە خەمباری ماڵاوایی لە سـەردار کردو بەرەو ماڵ گەڕایەوە، باوکی پرسیاری لە خالد کردو گوتی: کوڕم ڕۆیشـتیت بۆ لای سـەردار؟ زانیت هۆکاری نەهاتنەوەی بۆ قوتابخانە چی بووە؟

خالیدیـش ڕووداوەکەی بـۆ باوکی گێڕایەوە، پاشـان گوتی: بابەگیان ئایا تۆ ڕێگەچارەیەك شـك نابەیت؛ تا سـەردار واز لە قوتابخانـە نەهێنێتو درێژە بە خوێندنەکەی بدات؟ بەڕاسـتی ئـەو لە قوتابخانـە زۆر زیرەکـە، دڵنیام بە پشـتیوانیی خودا، پاشەڕۆژێکی ڕوونو گەشی دەبێتو دەتوانێت پلەی باش بەدەست بهێنێت..

باوکی خالد گوتی: بۆچی نا کوڕم، چارەسەری دەکەین، بەڵام لەبەرئەوەی خۆت سـەردار باش دەناسـیت، خاوەنی دەروونێکی بەرزو کەسێکی بە ئارامو بە قەناعەتە، هەرگیز یارمەتی لە ئێمە قەبوڵ ناکات، ئەگەر ئێسـتا پێی بڵێم ئەوەی لای وەسـتا حەسان دەسـتت دەکەوێت، من پێت دەبەخشم، بەڵام تۆ بڕۆ بخوێنەو لە قوتابخانە دامەبڕێ، هەرگیز لێمان قەبوڵ ناکاتو بە قسەشـمان نـاکات..، بەڵام من دەتوانم کارێکی بۆ بدۆزمەوە کە ڕێگر نەبێت لە خوێندنەکەی.

خالد: چۆنو چ کارێك؟

باوکی خالد: بڕۆ بۆ لای سەرداروو پێی بڵێ، با هەموو ڕۆژێك بەیانیـان بڕوات بۆ قوتابخانە، دوا نیوەڕوان بێت بۆ دوکانەکەی من کار بکات، بە شەویشدا سەرقاڵی سەعیکردنو پێداچوونەوەی وانەکانی بێت.

خالد بەم چارەسـەرە زۆر خۆشحاڵ بوو، زۆر سوپاسی باوکی کرد، داوای مۆڵەتی کرد تا بڕوات ئەم هەواڵە خۆشـە بە سەردار بدات، کاتێك گەیشـتە لای سـەرداروو ئەم هەواڵـەی پێ ڕاگەیاند هەردووکیـان زۆر خۆشـحاڵ بوون، باوەشـیان کرد بـە یەکداو سەردار زۆر سوپاسی خالیدو باوکی کرد.. خالدیش گوتی: هاوڕێی ئەزیزم هەرگیز بە تەنها جێت ناهێڵم!

ئیـدی لـەو ڕۆژە بـەدواوە، سـەردار بەیانیـان دەڕۆیشـتە قوتابخانەو دوانیوەڕوان دەڕۆیشتە دوکانی باوکی خالدو شەوانیش خەریکی سەعیو پێداچوونەوەی وانەکانی بوو.



ن: د. حسان شمسی پاشا
و: یەحیا محەممەد عەلی

# بەکارهێنانی دەرمان

دەرمانی "دژەوردەزیندەوەرەکان"

دەرمانی دژەوردەزیندەوەرەکان (Antibiotics)لەو کاتەوەی لە ناوەڕاستی سەدەی بیستەوە دۆزراوەتــەوە.. بەکارهێنانی، بەردەوام لە زیادبووندایە، بەشێوەیەکی چاوەڕواننەکراو! ئەم زێدەبەکارهێنانەش کێشەیەکی گەورەی دروستکردووە، ئەویش لاوازبوونی توانای چارەسەرکردنی ئەم دەرمانانەیە؛ لەبەرئەوەی پاش ماوەیەك لە زۆربەکارهێنانیان، ئیتر وردەزیندەوەرەکانی وەك (بەکتریا) بەرگریی بەرامبەر ئەم دەرمانانە پەیدا دەکەن، لە ئەنجامدا کەسەکە تووشی نەخۆشیی وەها دەبێت، پزیشکان دەستەوەستان دەبن لە چارەسەرکردنی!

١.دەرمانی «دژەوردەزیندەوەرەکان» چین؟

بریتیین لەکۆمەڵە دەرمانێك، بەکار دێن بۆ چارەسەرکردنی هەوکردنی میکرۆبی، لەڕێی کوشتنی ڕاستەوخۆی میکرۆبەکەوە، یاخود ڕێگریکردن لە گەشەکردنییەوە؛ تا کۆئەندامی بەرگریی لەش، زاڵ بێت بەسەریدا.

زۆربەی نەخۆشییەکانی گەدە، لە دوو جۆر وردەزیندەوەرەوە سەر هەڵدەدەن: بەکتریا، یان ڤایرۆس.

دژەوردەزیندەوەرەکان (Antibiotics) چارەی هەوکردنی میکرۆبییان پێ دەکرێت، وەلێ ناتوانن چارەسەری نەخۆشیی ڤایرۆسیی بکەن، بۆنموونە: هەڵامەتو ئەنفلووەنزا نەخۆشیی ڤایرۆسیین. کەوابێت: ئەم دەرمانانانە هیچ سوودێکیان نییە لە چارەسەرکردنیاندا.

دژەوردەزیندەوەرەکان، کاتێك بەشێوەیەکی دروست بەکار بێن، دەتوانن ژیانی مرۆڤێك ڕزگاربکەن، بەڵام گەر بەهەڵە بەکاربهێنرێن، زیان بە کەسەکە دەگەیەنن.

پێویستە پزیشك بڕیار بدات، لە چ کاتێکدا ئەم دەرمانانە بەکاربێن، یاخود چ کاتێك وازیان لێبهێنرێت؛ بۆئەوەی کۆئەندامی بەرگری، کاری خۆی بکات.

هەندێك کەس وا بیر دەکەنەوە بەکارهێنانی دژەوردەزیندەوەرەکان، هیچ زیانێکیان نییە، واتە: یان سوود دەگەیەنن، یان گەر سودیشیان نەبێت، زیانیان نییە! بەڵام لە ڕاستییدا، بەکارهێنانی ئەم دەرمانانە، بەبێ پێویستی، وا دەکات هەندێك لە میکرۆبەکان بەرگری پەیدا بکەن لە دژی ئەم دەرمانانە، بەمەش میکرۆبەکە زیاتر بەهێز دەبێتو زیانی زیاتر دەگەیێنێت، چارەسەرکردنیشی زۆر قورس دەبێتو لە لەشدا دەمێنێتەوە، لە ئەنجامدا نەخۆشیی وا دروست دەکات بە (دژەوردەزیندەوەر)ی ئاسایی چار ناکرێت.

میکرۆبەکان، زیندەوەری وەهان، توانای بەرگری لەخۆکردنو خۆگۆڕینیان هەیە، دژی ئەم دەرمانانە، بەتایبەت گەر بەشێوەیەکی نادروستو هەڕەمەکی بەکاربهێنرێن.

٢.کاریگەرییە نەرێنییە لاوەکییەکانی «دژەوردەزیندەوەرەکان»:

*کۆئەندامی هەرس: سووکە ئازاری گەدە، ئێڵنجدان، ڕشانەوە، سکچوون.

* سەرەڕای بەکتریا زیانبەخشەکان، لەناوبردنی بەکتریا بەسوودەکانی نێو کۆئەندامی هەرس، ئەمەش هاوکاریی دەرکەوتنی هەندێك میکرۆبی دیکە دەدات، لەوانە: «کەڕووی کاندیدا، کە دەبێتە هۆی هەوکردنو زیپکەی ناو دەم».

* هەستیاری (حەساسیەت)ی هەندێك کەس بۆ ئەم دەرمانانە.

* زیانی مەترسیدار بۆ گورچیلەکانو جگەر.

٣. چۆن ڕێگری بکەین لە بەرگرییکردنی میکرۆبەکان لە دژی دەرمانی (وردەزیندەوەرەکان)؟:

*بەکارهێنانی ئەم دەرمانانە بە بڕی گونجاوو بۆ کاتێکی گونجاو.

* دوورکەوتنەوە لە بەکارهێنانی ئەم دەرمانانە لە کاتی نەخۆشیی ڤایرۆسیی وەك، ئەنفلۆنزاو سەرمابوونی ئاسایی.

* دوورکەوتنەوە لە بەکارهێنانیان بەبێ پرسی پزیشكو لەخۆوە.

* پابەندبوون بە تەواو بەکارهێنانی دەرمانەکان وەك ئەوەی پزیشك داوای کردووە (بەهەمان بڕو کاتو ماوەی دیاریکراو).

* سەردانکردنی پزیشك لەکاتی ڕوودانی هەر کاریگەرییەکی نەرێنیی لاوەکییو لەخۆوە نەوەستاندنی بەبێ پرسی پزیشك.

* هەندێك کەس دەرمانەکە دەوەستێنێت، تەنها بەوەی هەست بە باش بوون دەکات، ئەمەش هەڵەیە!

٤. کاتێك پزیشك (دژەوردەزیندەوەرێك)ت بۆ دەنووسێت:

* بەتەواوی وەك ئەوەی پزیشك داوای لێ کردوویت بەکاری بهێنە، تەنانەت گەر هەستت بە چاکبوونەوەش کرد، مەیوەستێنە، لەبەرئەوەی گەر دەرمانەکەت زوو وەستاند، ئەوا میکرۆبەکە دەگەڕێتەوە باری گەشەکردن، سەرلەنوێ نەخۆشییەکە سەر هەڵدەداتەوە.

* هەرگیز هیچ دەرمانێك هەڵمەگرە؛ تا جارێکی تر گەر نەخۆش کەوتیت بەکاری بهێنیتەوە.





# ماسیی سەلەموونو سوودو زیانەکانی

سەلەموون یەکێکە لەو جۆرە ئەو ماسییانەی کە بەهای خۆراکی باڵاو چەند سوودێکی تەندرووستی باشیان بۆ لەش هەیە، سەلەموون زۆر دەوڵەمەندە بە ترشەکانی ئۆمێگا-٣ی بەسوود بۆ دڵو بیرەوەری، هەروەها ڕێژەیەکی بەرزی پرۆتینی هەیەو ترشەئەمینییە بنچینەییەکانی کە پێویستن بۆ لەش لە راپەڕاندنی فرمانە زیندەییەکان تێدایە.

ڤیتامینە بەسوودەکانی (سیو دیو کۆمەڵەی بی وەك سیامینو ڕیبوفلافین والفولاتو کوبالمین) تێدایەو توخمە کانزاییەکانی وەك کالیسیۆمو ئاسنو سیلینیۆمو توتیاو فسفۆرو پۆتاسیۆمی تێدایە، سەرەڕای بوونی چەورییەکی تەندرووست تێیدا، بەهۆی بوونی ترشەچەورییە بنچینەییەکانی وەك ئۆمیگا-٣.

### سوودەکانی

**١. بوونی ترشەکانی ئۆمیگا-٣ لە ماسیی سەلەمووندا:**

یارمەتیدەرە لە دابەزاندنی تێکڕای هەوکردنەکانی لەشو کەمکردنەوەی مەترسی ڕەقبوونی خوێنبەرەکانو بەرزیی گوشاری خوێنو وەستای دڵ، بەپێی لێکۆڵینەوەیەکی زانکۆی ڕۆژئاوای ئوسترالیا خواردنی ماسیی سەلەموون دووجار لە هەفتەیەکدا ئەو ڕێژەیەی پێویستە بۆ لەش، کە لە ئۆمیگا-٣ بەدەست دێت.

**٢. تەندرووستیی ئێسکەکان**

لە لێکۆڵینەوەیەکی نوێدا دەرکەوتووە، خواردنی ترشەچەوریی ئۆمیگا-٣ بەرێکی، یارمەتیی پاراستنی ئێسکەکان دەدات لە لاوازبوون، هەروەها بوونی پرۆتینی بچووك، کە بە پێپتیداتی زیندەیی چالاك ناو دەبرێن، توانای ڕێکخستنو جێگرکردنی فەرمانی بەرهەمهێنانی کۆلاجین دەکەن لەو شانە لینجەی نێوان ئێسکەکان، ئەوەش بە مانای بەهێزبوونی ئێسکەکان دێت.

**٣. ڕزگاربوون لە خەمۆکی**

ترشە چەورییەکانی ئۆمێگا-٣ ڕۆڵێکی زیندەیی گرنگیان لە راپەڕاندنی فەرمانەکانی مێشکو کۆئەندامی دەماردا هەیە، لەبەر ئەوە خواردنی ڕێکو بەردەوامی ماسیی سەلەموون، مەترسی تووشبوون بە خەمۆکی کەم دەکاتەوە.

**٤. مێشکو بیرەوەری**

ترشەچەورییەکانی ئۆمێگا-٣، توانایەکی باشیان هەیە لە بەجێهێنانی فەرمانەکانی مێشکو پاراستنی مرۆڤ لە بیرەوەریی لاواز، خواردنی سەلەموون لە کاتی دووگیانیو قۆناغەکانی منداڵی، یارمەتی بەهێزی بیرەوەری منداڵو کاری مێشك بەشێوەیەکی باش هەیە، ڤیتامینەکانی (ئەیو دی)و سیلینیۆم (یەکێکە لەو توخمانەی لە سەلەمووندا هەیە) کۆئەندامی دەمار دەپارێزێت لەو فەوتانەی بەهۆی چوونەسەری تەمەنەوە، دوچاری دەبێتەوەو دەیپارێزێت لە زەهایمەرو پارکنسۆن.

**٥. تەندرووستیی چاو**

خواردنی بەردەوامی ماسیی سەلەموون، یارمەتیی چاو دەداتو دەیپارێزێت لە وشکبوونەوەو لاوازبوونی تۆڕی چاو کە بەهۆی بەتەمەنبوونەوە تووش دەبێت، ئەوەش بەهۆی بوونی ئۆمیگا-٣ تێیدا.

### زیانەکانی ماسیی سەلەموون

خواردنی زۆرو بەردەوامی لەڕادە بەدەری سەلەموون، ئەگەری تووشبوون بە ژەهراویبوونی جیوەی هەیە، هەروەها یەکێکە لەو ماسییانەی مەترسی هەستیاریان هەیە، بۆیە پێویستە چاودێریی ئەوەی ڕوودەدات بکەیت، پێش ئەوەی لە خواردنی بەردەوام بێت.

سەرچاوەکان HTTPS: //DRAXE.COM
HTTP: //WWW.MEDICALNEWSTODAY.COM

# ئایا تۆ لە شوێنکارێکی گونجاودایت؟




ئەو وەڵامە هەڵبژێرە، کە لەگەڵ تۆدا دەگونجێت، لە هەر یەك لەم بیستو پێنج پرسیارەی خوارەوە:

**١- بۆچی دەڕۆیت بۆ کارکردن؟**

أ- لە پێناوی پەیداکردنی پارەو سامان.

ب- لە پێناوی پارە، بۆئەوەش کە کارێك ئەنجام بدەم.

ج- حەزم لە کارکردنەو هاوکات حەزیشم لە پارەو سامانە.

**٢- ئایا داواکاری پێشکەش دەکەیت بۆ پیشەیەکی نوێ، لە هەمان ئەو دەزگایەی کاری تێدا دەکەیت، یان لە دەرەوەی ئەو دەزگایەی کاری تێدا دەکەیت؟**

أ- ساڵانە زیاتر لە دوو جار داواکاری پێشکەش دەکەم.

ب- ساڵانە تەنها دوو جار داواکاری پێشکەش دەکەم.

ج- ساڵانە کەمتر لە دوو جار داواکاری پێشکەش دەکەم

**٣- کام لەمانە بەلاتەوە جوانترین وەسفن بۆ ئەو کارەی ئەنجامی دەدەیت؟**

أ- کارکردنم بەشێکە لە پێکهاتەی ژیان.

ب- کارکردن سەرچاوەی ڕزقو ڕۆزییە.

ج- کارکردن پێویست بۆ دڵنەواییم.

**٤- لە شوێنی کارەکەتدا، پەیوەندیت چۆنە بە هاوڕێو هاوکارانتەوە؟**

أ- بەرگەیان ناگرم، واتە: تاقەتی تێکەڵاوی و هەڵگرتنی خەمو ئازارەکەنیانم نییە.

ب- پەیوەندیم لەگەڵیاندا بەپێناوبەینە، واتە: لە هەڵکشانو داکشاندایە، هەندێجار باشو هەندێجاریش خراپ.

ج- ئەوان هاوڕێو هاوکارانی منن.

**٥- لە کۆتایی کاتی کارکردندایت، بەڵام هێشتا کارەکەت تەواو نەبووە، چی دەکەیت؟**

أ- دەڕۆیتەوە بۆ ماڵەوەو ڕۆژی دواتر کارەکەت تەواو دەکەیت.

ب- کارەکەت تەواو دەکەیتو داوای قەرەبووکردنەوەی کاتی زیادە دەکەیت.

ج- کارەکەت تەواو دەکەیت، گەرچی کرێی کاری زیادەش وەرنەگریت.

**٦- پەیوەندیت لەگەڵ بەرپرسەکەت چۆنە؟**

أ- زۆر باش نییە. ب- لەبەر بنەمای ڕازیکردنە. ج- من ئەو سەرۆکەم.

**٧- کاتێك بەیانیانی ڕۆژی شەممە، دوای پشووی کۆتایی هەفتە لە خەو هەڵدەستیت، بیر لە چی دەکەیتەوە؟**

أ- بیر لە ترسو نیگەرانی دەکەمەوە، لەم ڕۆژەو سەرجەم ڕۆژەکانی هەفتەش.

ب- زۆر باشە، ئێستا کاتی گەڕانەوە بۆ کاری سەخت.

ج- ئەم بەیانییە زوو دەڕۆمە سەرکارەکەم؛ بۆئەوەی قەرەبووی کارە فەوتاوەکانی هەفتەی ڕابردووم بکەمەوە.

**٨- چۆن گرنگیی کارەکەت هەڵدەسەنگێنیت؟**

أ- گرنگییەکی کەمی هەیە. ب- دەگونجێت زیاتر جۆراوجۆر بێتو چێژی زیاتری هەبێت. ج- چێژ دەبینم لەو کارەی ئەنجامی دەدەم.

**٩- دوای ڕۆژی کارکردن هەست بەچی دەکەیت؟**

أ- هەست بەدڵخۆشی دەکەم، لەبەرەوەی ئەمڕۆ کارەکەم تەواو بووەو ڕۆژێکی دیکەی کارکردن دێتە پێش.

ب- لە ڕووی جەستەییو دەروونییەوە هەست بە ماندووبوونو بێزاری دەکەم.

ج- سوپاسگوزارم کە بەسەرکەوتوویی، ڕۆژێکی کارکردنم تێپەڕاند.

**١٠- چاوت دەچێتە سەر کاتژمێرەکەو دەبینیت کاتژمێر سێی دوانیوەڕۆیە، تەنها دوو کاتژمێرت ماوە کارەکەت بەجێ بهێڵیت، لەو کاتەدا بیر لە چی دەکەیتەوە؟**

أ- دوو کاتژمێری زۆر دوورو درێژ دەبێت.

ب- هەموو شتێك کۆتایی دێت تەنانەت کاتژمێر پێنجیش.

ج- چەند زوو گەیشتمە کاتژمێر سێ.

**١١- ئایا لەسەر کارەکەت هەست بە بارگرژی دەروونی دەکەیت؟**

أ- هەموو ڕۆژێك بە زۆری دوچاری بارگرژی دەبم.

ب- زیاتر لە جارێك لە هەفتەیەکدا.

ج- زۆر بە دەگمەن.

**١٢- ئایا زۆرجار هەست دەکەیت بارودۆخی تەندرووستیت تەواو نییەو ناتوانیت بڕۆیت بۆ سەر کارەکەت؟**

أ- ساڵانە زیاتر لە پێنج جار.

ب- ساڵانە کەمتر لە پێنج جار.

ج- ساڵانە کەمتر لە دوو ڕۆژ.

**١٣- ئایا بۆت پێش هاتووە کە دوانیوەڕۆی ڕۆژی هەینی هەستت بە بێزاری بکەیت، لەبەر گەڕانەوەت بۆ سەر کارەکەت لە ڕۆژی دواتردا؟**

أ- بەڵێ هەمیشە. ب- هەندێجار. ج- هەرگیز هەست بە بێزاری ناکەم، بۆ دووبارە گەڕانەوە بۆ سەر کارەکەم.

**١٤- لە ماوەی ڕۆژی کارکردندا، چەند جار سەیری کاژێری**

نووسینگە، یان کاژێرەکەی دەستت دەکەیت؟

أ- لانی کەم سەعاتی جارێك سەیری دەکەم. ب- زۆرجار دووجار، یان سێ جار لە ڕۆژێکدا. ج- تەنها بەیناوبەین سەیری دەکەم.

١٥- لە کاتی کارکردندا، چی دوودڵو نیگەرانت دەکات؟

أ- نهێنیی کارکردن. ب- ئەرکی زۆر کە دەبێت ئەنجامیان بدەیت. ج- یان دەتەوێت ببیتە ڕکابەرێکی بەهێزو پیشەیی.

١٦- هەڵوێستت بەرامبەر تەکنەلۆژیای نوێ چییە؟

أ- حەز ناکەم بەکاری بهێنم، ئەگەر لە توانامدا بێت لێی دوور دەکەومەوە.

ب- پێویستە لەسەرم تەکنەلۆژیای نوێ قەبوڵ بکەم، بەڵام دەترسم نەتوانم خۆم بگونجێنم لەگەڵیدا.

ج- وەکوو بەکارهێنەرێکی نوێ زۆر بەگەرمیو بەپەرۆشەوە پێشوازی لێ دەکەم.

١٧- ئەگەر داوات لێ کرا بەشداری خولێکی ڕاهێنان بکەیت، چی دەڵێیت؟

أ- من حەزم لە خول نییە، ئەگەر دەکرێت ناوی من مەنووسن.

ب- زۆر باشە، بەڵام لە ڕاستیدا من کاتم نییە ئامادەی خول بم.

ج- زۆر بەخۆشحاڵییەوە بەشداری دەکەم، بەتایبەت ئەگەر خولەکە پەیوەندیی بە کارەکەمەوە هەبێت.

١٨- تا چەند گرنگی بەو دامەزراوەیە دەدەیت، کە کاری تێدا دەکەیت؟

أ- زۆر نا، تەنها ئەوەندەی کە من لە دامەزراوەکەدا کار دەکەم.

ب- من مشورخۆری هەر شتێکم کە ڕوودەدات، بەڵام بیرکردنەوەی سەرەکیم بریتییە لەو کارەی کە ئەنجامی دەدەم.

ج- بەڵێ، زۆر گرنگی بەو دامەزراوەیە دەدەم، کە کاری تێدا دەکەم.

١٩- ئایا زۆرجار کاتەکانت بە پێکەنینو خۆشی، لەگەڵ هاوکارەکانتدا بەسەر دەبەیت؟

أ- هەندێجار بەکەمی. ب- هەندێجار بەزۆری. ج- زۆرجار.

٢٠- ئایا لە کاتی کارکردندا، خەیاڵ دەتباتەوەو داڵغەت دەڕوات؟

أ- بەڵێ، زۆرجار. ب- کاتم نییە بۆ خەیاڵکردن. ج- زۆر بەدەگمەن.

٢١- ئەگەر داوات لێ کرا، بابەتێك بۆ ڕۆژنامەی کار بنووسیت، لەو کاتەی دەستبەتاڵیت، چی دەکەیت؟

أ- لە کاتی کارکردندا بابەتەکە دەنووسیت؛ چونکە لەو بڕوایەدا کە پشووو پێویستە بۆ کاری ئاسایی.

ب- دەپرسیت ئەگەر دەگونجێت، ئەو بابەتە لە لەکاتی زیادەدا بنووسیت؛ بۆئەوەی کرێی لەسەر وەربگریت.

ج- لە کاتێکی تایبەتی خۆتدا بابەتەکە دەنووسیت.

٢٢- کاتی فەرمی دەوامەکەت کاتژمێر ٨:٣٠ دەست پێ دەکات، وای دابنێ تۆ کاتژمێر ٨:١٠ خولەکە گەیشتوویتە سەر کارەکەت، چی دەکەیت؟

أ- سەرسامیت کە بەو زووە گەیشتوویت. ب- ڕۆژنامە دەخوێنیتەوە، تا کاتژمێر ٨:٣٠.

ج- هەر کات گەیشتیت؛ دەچیتە سەر کارەکەتو دەست بە کار دەکەیت.

٢٣- ئایا بەشداریی بۆنە کۆمەڵایەتییەکانی تایبەت بە کارەکەت دەکەیت؟

أ- هەرگیز، ب- جاروبار. ج- زۆرجار.

٢٤- لەناکاو بڕیاری گواستنەوەی شوێنی کارکردنت، بۆ بەشێکی دیکەی شارەکەت پێ دەگات، تۆ دوو بژاردەت لەبەردەستە، گواستنەوەکە قەبوڵ دەکەیت، یان داوای قەرەبوو دەکەیت؟ ڕاستەوخۆ پەرچەکردارت چۆن دەبێت؟

أ- پێویست بە دوودڵی ناکات، قەربوو وەردەگرمو بە دوای کارێکی دیکەدا دەگەڕێم.

ب- زۆر بێزارو بێتاقەت دەبم، لەبەرئەوەی بڕیارێکی زۆر قورسە.

ج- بڕیاری گواستنەوەکە دەدەم، ئەگەر توانیم ئەو کارە بکەم.

٢٥- ئایا زۆرجار نانی نیوەڕۆت پێیە لەسەر کارەکەت؟

أ- هەرگیز، ب- هەمیشە. ج- هەندێجار.

تێبینی: بۆ وەڵامی (أ) سفرو بۆ وەڵامی (ب) یەك خاڵو بۆ وەڵامی (ج) دوو خاڵ دابنێ.

ئەنجام:

ئەگەر کۆی خاڵەکانت گەیشتە ٤٠ — ٥٠ خاڵ:

ئەوا تۆ ئەو کارەی ئەنجامی دەدەیت، خۆشت دەوێتو تەواو لە کارو کارگەیەکی درووستدا کار دەکەیت، بە نیسبەت تۆوە ڕۆژانی شەممە، کە کاتی دەستپێکردنەوەی کارکردنە، هیچ کێشەیەکت نییە، لەبەرئەوەی هەمیشە تۆ چاوەڕانی ڕۆژ ی دواتری، بەردەوام چاوەڕوانی کاری باشترو نوێتریت، تۆ زۆر قەناعەتت بە ژیانی کارکردنت هەیە، ئەوەش لە ژیانی ڕۆژانەتدا ڕەنگی داوەتەوە، هەروەها بووەتە هۆی ئەوەی کە پەستانی چواردەورتی لەسەر سووك کردوویت.

خۆ ئەگەر پێویستت بە زیاتر باشککردنی بارودۆخی داراییت نییە؛ ئەوا پێویست ناکات هیچ گۆڕانکارییەك لە ژیانی کرداریت بکەیت.

بەڵام ئەگەر کۆی خاڵەکانت لە نێوان ٢٥-٣٩ خاڵ بوو:

تۆ کەسێکی هاوسەنگیت، قەناعەتت بە کارەکەت هەیە، هەندێجار زۆر چێژ دەبینیت لە کارکردنت، بەڵام هەندێجار، لە کاەکەتدا دوچاری بێهیوایی دەبیتو تەنانەت ڕقیشت لە کارەکەت دەبێتەوە، بەڵام لە کۆتاییدا ئەوە تەنها کارێکە بە نیسبەتی تۆوە، دەکرێت ئەو کارە نەکەیت، ئەگەر لەبەر بارودۆخی دارایی نەبێت. تۆ زۆر بەشەوقەوە بۆ کۆتایی هەفتەو پشووەکان دەڕوانیت، هەروەها بەپەرۆشەوە بۆ خەڵاتو بردنەوەکان دەڕوانیت، بەڵام هەمیشە ترست لەوەیە کە کارەکە لەوە خراپتر ببێت، پێویستە تۆ بە هەموو لایەنەکانی کارکردنتدا هەستیت، کە چێژی لێ دەبینیت، بیر لە چۆنێتیی باشکردنی لایەنەکانی دیکەت بکەیتەوە، لانی کەم کارەکەت قەبوڵ بکەیت.

بە نیسبەتی تۆوە، بۆ دۆزینەوەی کارێکی دیکە، هەوڵ بدە، کە زۆرتر چێژی لێ ببینیت، زەرەرە ناکەیت ئەگەر هەوڵی دۆزینەوەی پیشەو کارێکی دیکە بدەیت، بەڵام ڕاستەوخۆ لەسەر پێی خۆت باز مەدە، پێویستە بیر بکەیتەوە لە کەسانێك کە دەیانناسیت، هەندێجار ئەوە باشترە، واتە: بە هاوکاریو پرسو ڕاوێژی کەسانی بە ئەزموونو خاوەن پیشە، ئەو کارە بکە.

ئەگەر کۆی خاڵەکانت لە ٢٥ خاڵ کەمتر بوو:

هەوڵ بە گرنگیدانو ئامانجت بەرەو باشتر بگۆڕی، بە لەیەك تێگەیشتن لەگەڵ بەڕێوەبەرەکەت، یان هاوکارەکانت، خۆ ئەگەر ئەوە ناگونجێت، ئەوە باشترە بەجدی بیر بکەیتەوە لە گۆڕینی کارەکەت، یان لە نێو هەمان ئەو دەزگایەی کاری تێدا دەکەیت، یان بە گۆڕینی پیشەکەت بە تەواوی، لە ئێستادا تۆ دڵخۆش نیت بە کارەکەت، ئەوەش کاریگەری دەکاتە سەر ژیانی تایبەتیو هاوڕێو ئەندامانی خێزانەکەشت، ئەوەی لە تۆ داواکراوە، گۆڕانکارییەکی ئازایانەو بوێرانەیە.. ئەوەش بژاردە ڕاستەقینەکەیە.



# ئێمەو ئامێر

زاهیر زانــا

مرۆڤ بــۆ ئاســانکردنی کارەکانی، بەردەوام دروووســتکراوو داهێنــراوی نوێــی هەیــەو بەرەوپێشــچوونو گەشەســەندنی تەکنەلۆجیــاو ئامێــرەکان لەئێســتادا، بــە ڕێژەیەکــی ئێجگار گەورەیــەو هەمــوو بوارەکانــی گرتۆتــەوەو خزمەتێکــی زۆری کردووەو لەگەڵ خۆشیدا، کۆمەڵێك کێشەو گرفتو ئاریشەی نوێی هێناوەتە ئاراوە، کە پێویستی بە هەڵوێستەلەسەرکردنو تێڕامان هەیە بۆ ئەوەی بەشــێوازی درووست بەکاری بهێنن، نەك ئەوەی بەدەســتی مــرۆڤ درووســتکراوە، مرۆڤ کۆت بــکاتو کاتەکانی بسووتێنێتو ژیانی بەهەدەر بداتو پەیوەندییە کۆمەڵایەتییەکان بشــێوێنێتو لادانی ڕەوشــتیو ڕەفتاری درووســت بکات؛ چونکە گرفتی ئامێــرە ئەلکترۆنییەکان ئەوەیە کۆنترۆڵنەکراوەو ئەوەی ئــەو پەخشــی دەکاتو دەیگوازێتــەوە، دەگاتە ئێمــەو نەوەکانی ئێمەو بەویســتو بێویســتی خۆمان، کاریگەریی لەســەر ژیانمان بەجێ دەهێڵێتو بگرە نەخۆشــیی وابەستەبوون بە تەکنەلۆجیاو ئامێــرەکان، دەهێنێتــە ئاراوەو مــرۆڤ دەکات بە کۆیلەی خۆیو ئیــرادەی کۆنتــڕۆڵ دەکات، وەك لە ئەنجامــی توێژینەوەیەکدا هاتــووە، بەپێی ڕاپرســییەکان(٤٠٪ی گەنجــان، ڕۆژانە لە پێنج کاتژمێــر زیاتــر مۆبایل بەکار دەهێنن، کە ئەمــە بە ئالوودەنی تەکنەلۆژیا هەژمار دەکرێت. هــەر لەهەمان توێژینەوەدا هاتووە کــە (٨٠٪)ی گەنجان یەکەم شــت کە بەیانیــان ئەنجامی دەدەن، ســەیرکردنی مۆبایلە زیرەکەکانیانەو (٦١٪) ڕۆژانە دوو کاتژمێر بــەکاری دەهێنــن، ئەمە جگە لەوەی بۆتە هۆکاری ئەوەی شــەو تــا درەنگ نەخەونو بە ڕۆژیش سســتو تەمبەڵ بن بۆ ئەرکو فرمانەکانیان.

ئازیــزان، لاتان ســەیر نەبێت کە ئێســتا پەیوەندییەکان لە مــرۆڤ بۆ مرۆڤەوە، بووە بە پەیوەندیی مرۆڤو ئامێرو زۆرجار تەکنەلۆجیاو ئامێــرە زیرەکەکان، بوونەتە هۆکاری گوێنەدان بە پەیوەندییــە کۆمەڵایەتیو خێزانییەکانو گۆشــەگیریو ڕاکردن لە واقیعو خۆدزینەوە لە بەرپرســیارێتیی ژیانو درووســتکردنی دنیایەکی خەیاڵی.

ئێمە پێویستە هۆشــیارو بەئاگا بینو نەبینە کۆیلەی شتێك کە دەسسازی خۆمانەو بۆ خزمەتی ئێمە درووست بووەو ئێمەش نەبینــە ئامێرو ژیانمان بەهەدەر نەدەیــنو بەرنامەمان هەبێت بــۆ بەکارهێنانی تەکنەلۆژیاو ئامێرەکان، ئەگینا وەك دەریایەکی بێبن لەناویدا نوقم دەبینو نازانین شــەپۆلەکانی بەرەو کوێمان دەبــاتو ناگەینــە کەناری ئارامی. بۆیە چەنــد خاڵێك دەخەینە ڕوو؛ بۆئــەوەی بەرچاوڕوون بینو بە شــێوازێکی درووســت ئەم ئامێرانە بەکار بهێنین:

یەکــەم:- ئامانجــدار بــە لــە بەکارهێنانــی تەکنەلۆجیــاو ئامێرەکان، بزانە بۆچی مەبەستێك بەکاری دەهێنیتو بەگوێرەی ئەو مەبەستە، کاتی پێ ببەخشە. ئاگادار بە؛ زۆرجار بەکارهێنانی ئامێــرە زیرەکــەکان، وەك خواردنــی گوڵەبەڕۆژە وایــە، کۆتایی پێهێنانی، پێویستی بە زاڵبوونە بەسەر نەفسدا.

دووەم:- ئــەو ئامێــرو ئەکاونتــەی بــەکاری دەهێنیــت، لێی شــارەزا بەو بیناســەو بزانە چۆن بەکار دێــت، لەبەرئەوەی ڕەنگە شارەزانەبوون لێی، ببێتە هۆی ئەوەی کێشەو گرفتێکت بۆ درووست بکاتو شتێکی تایبەت بە تۆ بڵاو بکاتەوە، یا زیان بە تەندرووستیت بگەیەنێت، یاخود زیانێکی ماددیو مەعنەویت لێ بدات.

ســێیەم:- بەکارهێنانــی ئامێــرە زیرەکــەکان لەلایــەن منداڵەکانمانەوە، پێویســتی بە چاودێریو ئاڕاســتەکردن هەیە؛ چونکــە ئەوان توانای جیاکردنەوەی ڕاســتو چەوتیان بەباشــی نییەو ڕەنگە تووشی گرفتو کێشەی گەورەیان بکاتەوە، لە یەکێك لە چاوپێکەوتنەکاندا لەگەڵ ستیفن جۆبز دامەزرێنەرو خاوەنی کۆمپانیــای ئەپڵ لێی دەپرســن: منداڵەکانت چــۆن ئایپاد بەکار دەهێنن، ئەویش دەڵێت هێشتا بەکاری ناهێنن، لەبەر ئەوەی من وام پێ باشــە لەدەوری یەکتر کۆ ببینــەوەو گفتوگۆی بابەتێك، یان کتێبێك بکەین!

چوارەم:- پێویستە هەمیشە بەرنامەمان هەبێت بۆ ژیانمانو کاتەکانمــان بەفیــڕۆ نەدەیــنو بەگوێرەی پێویســتیو بە کاتی دیاریکراو ئامێرە تەکنەلۆجیەکان بەکار بهێنینو بزانین ئەوان بۆ ئێمــەن، نەك ئێمە بۆ ئەوان، دەبێت هەوڵ بدەین لە ڕێگەیانەوە زانیاریو تێگەیشتنو بەرهەمی زیاترمان هەبێتو بۆ شتی باشو بەشێوازی باش سوودو کەڵکیان لێ وەربگرین.

بەو هیوایەی هەمیشە شادو بەختەورو ئاسوودە بن.




# فیراسەتی هەیاسی خاس

زانستی فیراسەت، واتە: سەرناسیو شارەزابوون بەوەی تەنها بە سەیرکردن دەتوانیت بەرامبەرەکەت بخوێنیتەوەو لە نیازو ئاکارو کردەوەی تێ بگەیت، هەیاس لەم زانستەدا، کەسێکی بلیمەتو کەموێنە بووە، زۆر بەئاسانی بەرامبەرەکەی خوێندووەتەوەو لە مەبەستو نیازەکانی تێگەیشووە، لەم بابەتەدا بۆ زیاتر ئاشنابوونمان بە بلیمەتی هەیاسی خاس، باس لە چەند نموونەیەکی زانستی فیراسەتی هەیاسی خاس دەکەین.

* سوفیانی کوڕی حوسەین دەڵێت: لەناو مزگەوت لە خزمەتی هەیاسی خاسدا دانیشتبووین، لەو کاتەدا پیاوێك هاتە ژوورەوە، هەیاس گوتی: ئەو پیاوە خەڵکی بەسرەیە، لە هۆزی سەقیفە، کۆترێکی بە دیاری بۆ هاتووە، کۆترەکەش ڕۆیشتووەو نەگەڕاوەتەوە!

پیاوێك لە مەجلیسەکە هەڵساو ڕۆیشت بۆ لای کابراو پرسیاری لێ کرد، ئەویش هەروەکوو ئەوەی هەیاس گوتبووی، گوتی: من خەڵکی بەسرەمو لە هۆزی سەقیفمو کۆترێکم لێ ونبووە، بە دوایدا دەگەڕێم!

گوتیان: جەنابی قازی چۆن ئەوەت زانی؟

هەیاس گوتی: ئەوەی کە گوتم خەڵکی بەسرەیە، هونەر نییە، خۆی دیار بوو بەسرییە، بەڵام ئەوەی کە گوتم: لە هۆزی سەقیفە، سەقیفییەکان شانو شەوکەتێکیان هەیە، ترسو بیم لە ڕوخساریاندا بەدی ناکرێت، ئەوەش کە گوتم: کۆترێکی لێ ونبووە، من بینیم ئەو پیاوە بە دوای کۆتردا دەگەڕا، هەر کۆترێکی دەبینی، بە ئاسمانەوە، یان لەسەر درەختێك هەڵنیشتبێت، یان کەوتبێتە سەر زەوی، ئەو سەیری دەکردو لێی ورد دەبوویەوە، ئەوەش نیشانەی ئەوەیە، کە بەدوای کۆترێکدا دەگەڕێت.. بەوەدا زانیم کە کۆترێکی ون کردووە!

* هەیاسی خاس دەڵێت: ئەگەر لە دەروازەی شاری واسیت دابنیشم، هەر کەسێك بەلامدا تێبپەڕێت، دەزانم کێیەو چ کارەیەو چ پیشەیەکی هەیە!

* ئیسحاقی کوڕی سوەید بە هەیاسی گوت: سەبارەت بە دوو کەس هەواڵم بدەرێ.. هەیاس قسەکەی پێ بڕیو گوتی: بێدەنگ بە، من باش دەزانم تۆ چیت دەوێتو لەبارەی کێیەوە پرسیار دەکەیت.. هەیاس درێژەی بە قسەکانی داو گوتی: تۆ دەتەوێت بڵێیت: هەواڵی دوو پیاوی زۆرموسوڵمانو زۆرباشو زۆرچاکم پێ بدە لەم شارە، کە سەردانی کەس ناکەن، کەس نادوێنن، ناچنە لای کەس، ئەوانیش حەسەنو ئیبن سیرینن.. ئیسحاق گوتی: بەڕاستی منیش هەر هەواڵی ئەو دووانەم دەویست!

جارێکیان هەیاسی خاس کەڵەشێرێکی بینی، لە بری قووقەقووقو خوێندن، وەك مریشك، گارەگاری دەهاتو دانی دەخوارد.. هەیاس گوتی: ئەو کەڵەشێرە پیرەو بەساڵاچووە! گوتیان چۆن دەزانیت؟

گوتی: کەڵەشێری لاو، ئەگەر دانەوێڵەیەك بەدی بکات؛ دەست دەکات بە خوێندن؛ بۆئەوەی مریشکەکان لێی کۆ ببنەوە!

* جارێکیان هەیاسی خاس کەنیزەکێکی لە مزگەوت بینی، سینییەکی بەدەستەوە بوو، بە دەسماڵێك داپۆشرابوو، هەیاس گوتی: لەسەر ئەو سینییە کوللە هەیە..

کاتێك هاوەڵانی چوون سەیری سینییەکەی دەستی کەنیزەکەیان کرد، بینیان سینییەك کوللەیە. گوتیان: قوربان ئەمەت چۆن زانی؟

لە وەڵامدا گوتی: بینیم سینییەکە بە دەستییەوە سووکە!

* هەیاسی خاس سەیری جەنازەی پیاوێکی کرد، ڕووی کردە کەسوکارەکەیو گوتی: هاوەڵەکەتان زیندووە، ئەو نەمردووە! ئەوانیش جەستەی پیاوەکەیان داناو دایان نیشاند، کابرا چاوەکانی کردەوە، هەموان بینیان کە ئەو زیندوووە، ئیدی بە خۆشحاڵیەوە گەڕانەوە ماڵ.

کاتێك لێیان پرسیو گوتیان: چۆن زانیت ئەو کەسە زیندووەو نەمردووە؟

هەیاس لە وەڵامدا گوتی: سەیری پەنجەی قاچەکانیم کرد، قنجو قیت بوو، بەڵام مردوو پەنجەی قاچەکانی قنجو قیت نین، بەڵکوو شۆڕ دەبنەوە بۆ خوارەوە.

**ئەو شتانەی باوکم، لە ژیاندا پێی نەگوتووم!**

و: چیمەن لەتیف

# کەساسی بەهێزی دروووست دەکات

**تێگەیشستنو گەڕان بەدوای دانایی، پیشەی فەیلەسووفان، زانایانو دەسەڵاتدارانە، هەروەسا پیشەی پیاو چاکانیش بووە.**

**سەیر نییە دانایەك، یان زانایەك ببینین، گەشتی دوورودرێژ بەسەر زەویدا بکات؛ تا بگات بە ئاسۆی چەند زانینێکی نوێ، تا بەشێکی تاریکی هزری پێ ڕۆشن بکاتەوە، یان زیاتر لە ڕاستی نزیکی بکاتەوە.**

(ئیبراهیمی کوڕی ئەدهەم)، لە کەسە خواپەرستو دنیانەویستەکان بووەو کەسێکی خواناس بووە، بەدوای ڕاستیدا گەڕاوە، خۆبەکەمزان بووە لە بەرانبەر خەڵکیدا. پەڕەکانی ژیانی هەڵدەدایەوەو لە جۆرەکانی خەڵکی ڕادەما، بە هیوای ئەوەی لە ڕاستی نزیك ببێتەوە.

لەبەرئەوە زۆر خۆی سەرقاڵ کرد، بە هەواڵی ئەو تەرکەدنیایەوە کە لە کوخێکدا ژیانی دەگوزەراند،ساڵانەو لە مانگیکدا خەڵك سەردانییان دەکرد، لە دەرگای میحرابەکەیدا قوربانیان دەکوشتەوە، داوایان لێ دەکرد نەخۆشەکانیان چاك بکاتەوە، کارئاسانییان بۆ بکات، لە تاوانەکانیان خۆش بێتو ڕێنمایی سەرگەردانەکانیان بکات!!

ئەوەی جێگای سەرسوڕمانی ئیبراهیم بوو، تەرکەدنیاکە ساڵانێك بوو، کوخەکەی بەجێنەهێشتبوو، لەوێدا نیشتەنی بوو، هەرگیز دوور نەدەکەوتەوە.

ئیبراهیم ماوەیەکی زۆری بڕی؛ تا حاڵی ڕاهیبەکە ببینێتو بۆ ئاینی چاکسازیو ڕێنمایی بانگی بکات، لەو مانگەدا کە تەرکەدنیاکە پێشوازی لە خەڵك دەکرد ئیبراهیم گەیشتە شوێنی ڕاهیبەکە، تەواشای کرد لە شوێنی نیشتەجێبوونی کەسانێکی زۆر گرد بوونەتەوە، لەگەڵ ئەو بارودۆخەشدا گەیشتە لای ڕاهیبەکە، دانیشت، تەماشای کردو لە لوتکەی گەورەییو ئەو شکۆدارییە وردبوویەوە، کە شوێنکەوتووانی بۆیان ڕێك خستبوو، ئەو کەشە جێگایەکی بەرزی بۆ دروووست کردبوو، بەشێوەیەك فەرمانەکانی جێبەجێ دەکرا، گوێیان بۆ ڕادەدێرا.

کاتێك (ئیبراهمی کوڕی ئەدهەم) خۆی پێ ناساند، یەکەم پرسیاری لەبارەی ئەو ماوەیە بوو، کە لەو جێگایەدا مابوویەوە؟ لە وەڵامدا گوتی: ماوەی سی ساڵە لێرەدا نیشتەجێمو لەم شوێنە دوور نەکەوتوومەتەوە.

ئیبراهیم بە ڕاهیبەکەی گوت: چی وای لێ کردی ئەو ماوەیە، لێرەدا بمێنیتەوە. چۆن توانیت بەو شێوەیە ئەو ماوەیە خۆڕاگر بیت.

تەرکەدنیاکە بزەیەك گرتی، لە کوڕی ئەدهەم نزدیك بوویەوە، گوتی: تەماشای ئەو خەلقوڵڵایەی دەورم بکە، چ ئاپۆڕەیەکیان



دروووست کردووە؟! گرنگترین داواکارییان، مەبەستی گەورەیان، سەردانیکردنمە لەم مانگەو لەم جێگایەدا، بەخاتری ئەم مانگە، بەرگەی گشت ئەو نارەحەتیانەی تر دەگرم، لەو یازدە مانگەدا!

بەرانبەر وشەکانی تەرکەدنیاکە ئیبراهیم وەستاو بە گژ فکراندا چوو، بەشێوەیەك وەڵامی بەرانبەرەکەی تووشی سەراسۆیی کرد، بەسەرسوڕمانەوە پرسیاری لە خۆ کرد: ئەم گومڕایە ئامادەیە لە پێناو چێژی چەند ڕۆژێکی دیاریکراودا، بەرگەی ئازاری چەندین مانگ بگرێت، بەتەنها بەرگەی ئەو ئازارە دەگرێت، لە پێناو گەورەیی‌و شانازییەکەدا؟!

باشە دەبێت خاوەنپەیامە ڕاستەکان، حاڵیان چۆن بێت، لە کاتێکدا ئەوان خاوەن پەیامی ڕاستەقینەو بەهای بەرزن، هەمیشە دەم بە هاوارو گازندەن، ماندوو تەوەزەلن؟!

دەبێت حاڵی پیاوچاکانو پێشەوایانی ئەم نەتەوەیە "نەتەوەی ئیسلام" چۆن بێت، لە کاتێکدا خاوەنی ڕاستین، چی دەبوو ئەگەر لە پێناوی باجی ڕاستیدا، بڕێك ئارامیان گرتبا، نرخی تێکۆشانیان دابا؟!

باشە، کەسێك بزانێت بەهەشت خانەی دڵنیایی‌و ماڵی کۆتاییە، چۆن دەوەستێت‌و بادەی عەیش، نۆش دەکات.. دەم دەنێت بە خۆشییەکانی ژیانەوە، تەنانەت خڵتەکانی ژیانیش فڕ دەکات، دواتر دەکەوێت‌و شکست دەهێنت، بەخششی ڕاستەقینە لەدەست دەدات، پلەوپایەیەك کە هیچ شکۆمەندییەك پێی نایگات.

لەگەڵ ئەوەی زۆربەمان شانازی بە توانا بێهاوتاکانمان دەکەین، بە شێوەیەکی درووست بەسەر شتەکاندا، زیرەکیمان لە بەدەستهێنانی دەستکەوتەکانماندا دەسەلمێنین، بە شێوەیەکی سەرسوڕهێنەر، زۆربەمان بەشێوەیەکی ڕاست، ناتوانین ئەو هاوکێشە ڕوونو ئاشکرایەی ژیان ببینین کە دنیا کاتییە، نەمری لە ژیانی دوارۆژدایە.

بەڵێ، هەموان دەزانین، هەستانەوە لە گۆڕ، ڕاوەستان لە مەحشەر هەیە، دواتر تەرازوو دادەنرێت، کردەوەکانی پێ دەکێشرێت، ڕۆیشتن بەسەر سیراتدا هەیە، لە کۆتاییدا پاداشتو سزا دیاریکراوە، بەداخەوە زۆربەمان نەخشەی کرداری ناکێشن؛ تا بتوانین لە ئەنجامی ئەو هاوکێشەیە تێ بگەین!

ئەوەی ئیبراهیمی بەئاگا هێناو لەو ڕاهیبە تێگەیشتو گەیاندنی بەئێمە ئەوەیە کە خاوەن پەیامەکان هەرگیز دەستبەرداری لوتکەی شەرەف، شکۆداری‌و ویژدان نابن.

ئارامگرتن لەسەر فریودەرەکانی ژیان، ئەو شتانەی ئارامی ژیان دەبزڕکێنن، جوانییەکانی دەشێوێنن، یەکەم ڕێگاو تەنها ڕێگایە بۆ گەیشتن بە خۆشگوزەرانی ڕاستەقینەو نەبڕاوە.

دڵۆپەی تیشك

خۆشگوزەرانی، شتێکە لە ناخی مرۆدایە، ناکرێت لە دەرەوە هاوردە بکرێت، ئەگەر خۆشگوزەرانی درەختێك بێت، کێڵگەی ناخو دڵی ئادەمیزاد بێت، باوەڕ بەخودا، بە ڕۆژی دوایی، ماڵو خۆراكو هەواو تیشکی ئەو خۆشنودییەیە (یوسف قرضاوی).

# سی چرکە بە دیار قسەکانی "برایان ئەدیسۆن"ەوە

وای لێ بکدەرەوە، ژیان وەك یارییەکە، یاسای ئەم یارییە ئاوایە: کە دەبێت ٥ تۆپ لە یەك کاتدا هەڵبدەیت بۆ ئاسمانو نەهێڵیت هیچیان بکەونە سەر زەوی! یەکێك لەو تۆپانە لاستیکە! چوار تۆپەکەی تریش شووشەیە دەی دیارە گەر تۆپە لاستیکێکە بکەوێتە سەر زەوی؛ ئەوا هەڵدەبەزێتەوەو دیسان دێتەوە سەرەوە، بەڵام چوار تۆپەکەی تر، هەر کە کەوتنە سەر زەوی؛ ئەوا دەشکێنو نابنەوە بەو تۆپەی یەکەم جار! ئەو لە درێژەدا دەڵێت: ئەو چوار تۆپە شووشەیە بریتین لەمانە: خاووخێزان، لەشساغی، هاوڕێکانو ڕۆحی خۆت، تۆپە لاستیکێکییە ئیشەکەتانە! ئیش بەسەر هیچ یەك لەم شتانەی سەرەوەدا مەسەپێنن؛ چونکە هەمیشە ئیشێك هەیە تا بیکەیت! بەڵام هاوڕێیەك کە ڕۆشت، ئیدی ناگەڕێتەوە! خاووخێزانێك کە لێك ترازا، ئیدی کۆ نابێتەوە! لەشساغی کە لەدەست چوو، ئیدی ناگەڕێتەوە! ڕۆحی ئازاردراویش، چیدی ئارام نابێتەوە!



# وەڵامی بەجێ



ڕۆژێکیان، خەلیفە هاروونەڕەشـید، کەسـێکی نارد بەدوای باڵووڵـدا، پێی گوت: خەونێکم دیوە، ئەگـەر بۆم شـی بکەیتەوە، ئەویش گوتی: فەرمـوو چیت بینیوە؟ خەلیفە گوتـی: لە خەودا بینیم، بووبووم بە گیانلەبەرێکی دڕندەو بە هەموو هێزو توانام، پەلاماری ئەملاو ئەولام دەداو هەموو شتێکم تێك دەشکاند. باڵووڵی حەکیم لە وەڵامدا دەڵێت: ئەوە ڕاسـتییە، ببوورە من خەون شـی دەکەمەوە، بەڵام ڕاستی نا!

ڕۆژێـك یەکێـك بەلووتبەرزییەوە بە باڵـووڵ دەڵێت: تۆ چ جیاوازییەك لـە نێوان منو خۆتدا دەبینیت؟ چ شتێکی سەیر؟

باڵووڵـی حەکیمیش لە وەڵامدا دەڵێت: دووشـت کە لە منو تـۆدا بوونیان هەیە، کابراش گوتی: ئەو دووشتە چین بابیانزانم؟

باڵووڵیش گوتی: دوو شـتی پڕو دوو شـتی بەتاڵ؛ ئەوەی کە پڕە گیرفانی تۆیەو مێشـکی منە، ئەوەی کە بەتاڵیشە؛ گیرفانی منەو مێشکی تۆیە! کابرا بەشەرمەزارییەوە سەری دانەواندو ڕۆیشت.

لە ئەسکەندەریان پرسی: چ شتێکت بەدەست هێناوە کە زۆر پێی دڵخۆش بوویت؟

لـە وەڵامـدا گوتی: توانام لە خەڵاتکردنی کەسـێك کە چاکەی لەگەڵدا کـردووم، کە خەڵاتەکەم زیاترو باشتر بووبێت لە چاکەکانی ئەو!

بە محەممەدی کوڕی ئەبوحەنیفەیان گوت: باوکت چۆن بەبێ حەسـەنو حسێنێ برات، دەتخاتە نێو تەنگوچەڵەمەو تالووکەوە؟ لەوەڵامدا گوتی: دووبراکەم وەکوو چاون بۆ باوکم منیش دەسـتەکانی ئەوم، لەبەرئەوە بە دەستەکانی، چاوەکانی دەپارێزێت!

دەزانن چی مرۆڤ دەکاتە شکستخواردوویەکی باش؟ ڕاهێنان!

هەمینگوای -نووسەر-

با هەمیشە چاوەکانت کراوەو دەستت داخراو بێت.

جۆن شتاینبیك -نووسەر-

لە هەڵوێستە سەختەکاندا، بوێرترین پلان، ئەمانترینیانە.

تایتووس لیڤی -مێژوونووس-

ئەگەر دەتەوێت، هەموو جیهان فریو بدەیت، ڕاستی بڵێ.

بسمارك -ڕاوێژکاری ئەڵمانی-

کۆنترینو کورتترین وشە، «بەڵێ»و «نەخێر»ن. ئەو دوو وشەیە، گەورەترین بڕی بیرکردنەوەیان دەوێت.

فیساگۆرس -فەیلەسووف-

# گوڵی بۆ ژیان

# هەموو شتێك قورسە، پێش ئەوەی ئاسان ببێت

هیچ مرۆڤێك ناتوانێت ژیانی لە تەنیایی ڕەهادا بەسەر ببات، هەر پێویستی بە خەڵکی دەوروبەری هەیە. ناچاری بێت یان بژاردەکی، مرۆڤ لەگەڵ (مرۆڤ)دا دەژی، لەنێو مرۆڤەکانیشدا هەوڵ دەدات، هەست بە بوونی خۆی بکات، دەیەوێت هەبێتو دەوروبەرەکەشی حسابی بوونی بکەن، ڕێزی لێ بگرنو هەستی ڕابگرن... مرۆڤ هەوڵ دەدات بوونی خۆی بسەلمێنێت، خۆسەلماندنیش پێویستی بە کارامەییو لێهاتوویی هەیە، خودی ژیانیش خۆی پێویستی بە فێربوونی دەیان کارامەیی هەیە، لە زانینی شێوازی هەناسەدانو ڕێکردنەوە، تا کارامەییەکانی نووسینو توێژینەوەو بیرکردنەوەو داهێنانو تەواوی ئەو لێهاتووییانەی تر، کە جوانکاریی ژیانن.

فێربوونو وەرگرتنی کارامەییەکان، تێفکرینو بڕیاردانو هەوڵو لێبڕانو کاتو بەردەوامی دەوێت. هەستانەوەی دوای کەوتنەکانو گەشبینیو ئومێدەواریی داینەمۆی دەستخستنی کارامەییەکانن، دەبێت مرۆڤی ورەبەرز خاوەنیان بێت. کەمەکان بەکەم نەزانێتو بە کەمەکانیشەوە نەوەستێتو بەردەوام بەرەو بڵندیی هەنگاو بنێت.

زیرەکانە تێفکرەو کامە کارامەیی لە پێویستیو جوانکاریی ژیانی تۆیە، (فێربوونی زمانێکی نوێ یان، شۆفێریی، لێنان، یادهێنانەوە، خوێندنەوەی خێرا، نووسین...) دیاری بکەو بڕیار بدە دەست پێ بکەیت. هەموو ئەو شتانەی نایانزانیت، قورسو گران دێنە بەرچاو، زۆر جار ئەستەم دەیانبینیت، بەڵام لەیادت بێتو دڵنیاش بە کە هەموو کارامەییەکان (کە تەنها کەسێك بتوانێت لەم جیهانەدا بەدەستی بهێنێت، تۆش دەتوانیت بەدەستی بهێنیت- جۆن گریندەر) گەرچی بەر لە دەستپێکردن ڕێگای فێربوونیان نارەحەتو پڕ لە ئاستەنگیش بێتە پێش چاو، بەڵام هەر دەتوانیت دەستەبەریان بکەیت. هەریەکەمان دەیان نموونەی لە ژیانیدا هەیە، ئەگەر ئێستا زمانێکی جگە لە زمانی دایك دەزانیت، ئەها پێش دەستپێکردن چەند بەلاتەوە قورس بوو؟! ئەگەر هەنووکە شۆفێرێکی لێهاتوویت، بیرتە لە میانەی فێربووندا، چەند ئەستەم بوو بەلاتەوە وێنەی خۆت ببینیت بە تەنیاو لەسەر شەقامێکی قەرەباڵغ ئۆتۆمبێل دەئاژوویت؟ کەچی ئێستا زۆر سادەیە بەلاتەوە. لە خەیاڵتدا ماوە کە سەرەتای ساڵی خوێندن، هەندێك لە کتێبەکانی پرۆگرامی خوێندن چەند ئەستوورو پڕ لە هاوکێشەو نووسینو زانیاریو پێناسەو... دەردەکەوتن، بەڵام ورد ورد ئەو ڕوانینەت گۆڕاو تێیدا دەرچوویتو نمرەی بەرزیشت بەدەست هێنا. پەککوو لەو ترسە زەبەلاحەی!! ئەها لەکاتی چاوپێکەوتنی یەکەمجاردا هەتبوو، بەڵام هیچ وا دەرنەچوو! تۆ بیر بکەرەوە، چەند جار لە ژیانتدا کەوتوویت، بەڵام ئەوەتا ئێستا لەسەر پێیەکانی خۆت وەستاویت!

خوێنەری بەڕێز، ئەم دیارییەت پێشکەش: "دڵنیابە لە دوای بڕیاردان، کۆڵینەوەی پێشوەختو گرتنەبەری ڕێوشوێنە شیاوەکانو هەوڵی یەکبینەو لێبڕانو بەردەوامبوون، دەمانگەیەنێتە ئامانجەکانمان".

هێندەش گوێ بۆ ئەو نارەحەتیو ئاڵۆزییانە مەگرە کە لە سەرەتای کارەکاندا دەبینرێن، زۆربەی مەسەلەو لێهاتووییەکان لە سەرەتادا بۆ کەسە سەرەتاییەکان لەو بوارەدا هەر قورسو ئاڵۆز دەردەکەون، خۆ دەبێت تۆزێك خۆیان قورس بکەن، با بیکەن، تۆ بەردەوام بە، شتەکان خۆیان بەدەستەوە دەدەن. کاتێك تۆ سەرەتاییت لە کارو بوارێکدا، تواناکانت لەو بوارەدا بەراورد مەکە بە تواناکانی کەسێك کە تەمەنێکی لەو بوارەدا بەسەر بردووە. زۆر گرنگە، ئەو فشەڵییەی لە سەرەتادا کارەکانی پێ دەردەکەون، لەجووڵەمان نەخەن، نەمانترسێننو ئاستەم نەخەینە نێو فەرهەنگە تایبەتییەکەمانەوەو دڵنیابین کە هەموو کارەکان ئامادەباشییان دەوێتو ئاساییە کە لە سەرەتادا قورس دەربکەون، بەڵام ورد ورد هەر ئاسان دەبن.



سەروەر حەسەن

# بـــا سەربکەوین

سـنوور فـائق

لەمپەرەکانی بەردەم سـەرکەوتن زۆرن، بەڵام گەشـتن بە ئامانجو سەرکەوتن، کۆشیشـی دەوێـت. ڕێگاکانی گەشـتن بـە لوتکە فـراوان، بەڵام ڕێگەی سـەرەکی بەردەوامـیو هەوڵدانـە. ئامانجەکانـت دیاری بکـە. بەردەوام بـە لەهەوڵدان، تا دەگەیت بە خەیاڵو هیواکانت. هیچ شتێ لەتوانای مرۆڤ بەدەر نییە. تۆ دەتوانیت بگەیت بـەوەی بەمەحاڵت داناوە، بەڵام دەبێت لە پێناویدا بجەنگیت، بینیـوتـە مێرووڵەکان چەند لاوازنو چ بارێکی قورسو گران هەڵدەگرن، کە پێـنج هێندەی توانایـی جەسـتەی خۆیەتـی؛ چونکە سـەختییەکان بە هێزی هیمەتو باسـکی جوامێری هەڵدەگیرێت، نـەك بە هێزی جەستەوو شانو مـلی پان!

ئـەی مـرۆڤ، وەرە دونیایەکی قەشـەنگ بونیاد بنێو سـەرلەنوێ خۆت درووست بکەرەوە. مەڵێ ناتوانم!!!مەڵێ نازانم!!! مەڵێ مەحاڵە!! مەڵێ ناکرێتو نابێـت!! هیچ شـتێك لە توانای تۆ بەدەر نییە، تـۆ مرۆڤیت ئەوەی دەتەوێت، هەنگاوی بۆ بنـێ، ئـەوەی هەنگاو نانێتو لەشوێنـی خۆی ناجووڵێت. تۆ نیت ئەی مرۆڤ. ئەوە درەختەکانن شـتە بێـڕۆحو گیانەکانن. تۆ بێهوودە لە ژیان درووست نەکراویت. گەرنـا جیاوازیت چییە لەگەڵ دارو بەردو درەختەکاندا؟!، هتد... ئامانجێك دیاری بکەو هەوڵی بۆ بدە؛ چونکە مرۆڤ ناکرێتو نابێت بێ ئامانج بێت.. واز بهێنە لە بیرکردنەوە نەرێینـەکان. بەدوای خەونەکانت بڕۆ، دوور نییە هەنگاوێکت مابێت بۆ سەرکەوتن بەردەوام بەو ئەو هەنگاوە بنـێ. کلیلـی هەموو دەرگا داخـراوەکان، بەردەوامیو کۆششـە. ئەی مرۆڤ، تۆیەك خواوەنـد خەڵقی کردوویـتو عەقڵی پێ داویت بەجیاواز لـە بوونەوەرەکانی تر، چی زیاتر دەوێت بۆ سـەرکەوتن؟!!! جیاوازی مرۆڤو ئاژەڵو گیانلەبەرانی تـر، تەنها عەقڵ نییە. بگـرە خـــواسـتو بڕیـارە... دەی کەوایە؛ چاوەڕێی چیـت؟؟!!! بڕیـار بدە!! بڕیار بدە کە بەردەوام بیـت، بڕیار بدە کۆڵ نەدەیت، بڕیار بدە ئەمڕۆت لە دوێنێ باشـترو سـبەیت لە ئەمڕۆ باشتر بێت.. باوەڕو ئیرادەت بەهێز بکە، خۆت بەلاواز مەبینە. متمانەت بە خۆت هەبێت، دەگەیت بەو ئامانجەی کە دەتەوێت.پێوسـیتە ئامانجێکـت هەبێتو هەوڵی بۆ بدەیت، بەردەوام بیت لەسـەر ئەو کۆششـە. گەرنـا ناگەیت بەهیواو خەونەکانت. وای لێـك بدەرەوە، تـۆ گەڕیدەیـەکیت، هاتوویت بۆ گەشـت، لە نزیك گەشـتن بە کۆتای سـەفەرەکەت، دەگەڕێیتە دواوە، بە بەهانـەی ماندووبوون، بێزاری، هتـد...!! ئایـا لەم کاتەدا هیچ چێژێك لەو گەشـتە دەبینـیـت؟! نەخێر، لەم کاتـەدا تەنهـا زەرەرمەند دەبیـتو بێهوودە تا ئێرە هاتوویـت؛ چونکە تۆ لە سـەرەتاوە ئامانجت گەشت نەبووە بە کۆتایی، تۆ بەردەوام نەبوویت، تۆ خۆت دایە دەسـت ماندوبوون.. تۆ خۆت بـەلاواز بینی..بەڵام ئەگەر بەردەوام بایت، دەگەیشتیت بە کۆتایی ڕێگەکەتو ئەو شوێنەی کە خۆت دەتەوێت.

بـا خەونەکانـت گەورەتر لە کۆسـپو لەمپـەرەکان بن، هەنـگاو بنێ بۆ هەمـوو خەیاڵەکانت، قۆناغ بەدوای قۆناغ پێی دەگەیت، بەڵام زۆر خێرا مەبە لـە هەوڵدان بـەدوای خەیاڵەکانت. خۆ تۆ باڵندە نیـت بفڕیت! بەهێمنییەوە کارەکانـت بکە، گرنـگ ئەوەیە بگەیت بە مەبەسـت. بەسـەبـر بـە، هەنگاو دوای هەنگاو هەڵبڕە، بڕیار بدەو دەسـت پێ بکە بۆ هەنگاوی یەکەم؛ چونکە گرنگتریـن هانگاو بڕیاردانەو دەسـتکردنە بە هەنگاوی یەکـەم. خەونەکانت وەك سـەرکەوتن ببینە بەسـەر پەیژەکاندا، هەتا دەگەیت بە لوتکە، چەندین بەربەسـت دێنە سـەر ڕێت! دەبێت سـەر بکەویتو ئەو بەربەسـتانە ببڕیت. خەیاڵەکانت بەدوای تۆ ناکەون، دەبێت تۆ بەدوای خەیاڵەکانت بڕۆیت. لەهەر شـوێنێکی ئـەم جیهانـە بیت، بەبێ هـەوڵ ناگەیت بەهیـچ؛ چونکە لە هەر جێگەیەك بیت، ئاسـمان هەر شـینـەو لەو ئاسـمانەش ئەستێرەو مانگـو ڕۆژ هەیە. نەمبیسـتووە، نەمدیوەو نەبووە!! لە ناوچەیەك، یان لە شوێنێك ئاسمان ئەڵماسو یاقووتی لێ ببارێتو لە جێگەیەکی دیکەش، یان ناوچەیەکی دیکەش، لـەو زیخو بەرد لەئاسـمان بێتە خـوارەوە. ئەوەی تـۆ دەگۆڕێت، جێگەکەت نییە، بەڵکوو هێزو خواسـتو بڕیارو خەونەکانی خۆتە! هەوڵدانە بۆ گەشـتن بەو خەیاڵانەو پێویسـتی بە بەردەوامییە. خـۆ دەبیـنیت کە پاییز دێت؛ درەختـەکان زەرد هەڵدەگەڕێنو گەڵاو گوڵیان دەوەرێت. ببینە درەختەکان بە ئومێـدی هاتنەوەی بەهار، خۆڕاگـر دەبن لەبەردەم ڕەشـەباکان، لە کۆتاییدا دووبارە سـەوز دەبنـەوە. خۆ بەردەکانیش هەمیشـەو هەمیشـە لە جێگەیەك ناوەسـتن، لافاو بارانەکانیش شـوێنی ئەوان دەگۆڕنو لەو جێگەیە دەجووڵێن. ئـەی مرۆڤ تۆش ئیرادەی خۆت بەهێز بکە، ببە بە مرۆڤێکی ئیـرادە بـەرز. بڕیار بدە، پەنجەرەیەك بەڕووی خەونەکانتدا بکەرەوە، هەنگاو بنێو بەردەوام بە لە کـۆشـش. ڕەنگە درەنگ بگەیت بە خەونەکانت، بەڵام «شـتێـك نییە بەناوی شکسـت» باوەڕو متمانەت بە خۆت هەبێتو بڕیار بدەو هەنگاو بنێو بەردەوام بە...کە ئەمانەت کرد لەکۆتایی هەر دەگەیت بەمەبەست»



# جیاوازیی لە نێوان سەرکەوتووو شکستخواردوودا

١. دۆڕاو لە یەکەم کەوتندا تەسلیم دەبێت، سەرکەوتوو دەکەوێت، بەڵام لە کۆتاییدا سەردەکەوێت.

٢. دۆڕاو دەگەڕێت بۆ سەرکەوتن لە کۆتاییدا، سەرکەوتوو لە ڕێگەی تاقیکردنەوەوە، سەرکەوتن بەدەست دەهێنێت.

٣. دۆڕاو شتەکان دەکڕێت، سەرکەوتوو شتەکان دروست دەکات

٤. دۆڕاو شتە نوێیەکان دەبینێت، بەڵام بەهۆی تێنەگەیشتنیان تووشی تێکشکان دەبێت..

سەرکەوتوو شتە نوێیەکان دەبینێت، بەڵام بەهۆی تێنەگەیشتنیان، تووشی تێکشکان دەبێت

٥ . دۆڕاو لەگەڵ کەسانی تردا قسە دەکات، سەرکەوتوو لەگەڵ کەسانی تردا پەیوەندی دروست دەکات.

٦. دۆڕاو هەوڵ دەدات هەموو ئامانجەکان بەدەست بهێنێت لە یەك هەنگاودا، سەرکەوتوو هەوڵ دەدات سەرکەوتنو دەستکەوتەکانی زیاد بکات، هەتا دەگات بە ئامانجەکانی.

٧. دۆڕاو چاوەڕوانی ئەنجامێکی دیاریکراوە، سەرکەوتوو ئامادەیە بۆ ڕووبەڕووبوونەوەی هەر ئەنجامێکی چاوەڕواننەکراو.

٨. دۆڕاو دەگەڕێت لە ڕێز لەلایەن بەرامبەرەکانییەوە، سەرکەوتوو ڕێزی بەرامبەرەکانی بەدەست هێناوە.

٩. دۆڕاو بیرو تەرکیزی لای گرفتو کێشەکانە، سەرکەوتوو هەمیشە دەگەڕێت لە چارەسەرەکان

١٠. دۆڕاو شتەکان دوور دەخاتەوە لە ڕووداوەکان، سەرکەوتوو خۆی شتەکان دروست دەکات.

١١. دۆڕاو دەیەوێت سەر بکەوێت بەسەر بەرامبەرەکانیدا، سەرکەوتوو یارمەتیی بەرامبەرەکانی دەدات؛ بۆئەوەی سەربکەوێت.

١٢. دۆڕاو هاوڕێیەتیی کەسانی شکستخواردوو دەکات، سەرکەوتوو هاوڕێیەتیی کەسانی سەرکەوتووتر لە خۆی دەکات.

١٣. دۆڕاو ڕادەکاتو پشت دەکاتە مەترسییەکان، سەرکەوتوو ڕووبەڕووی مەترسییەکان دەبێتەوە.

١٤. دۆڕاو کاتە بەتاڵەکانی لە سەیرکردنی تیڤیو تەکنەلۆژیای نوێ بەفیرۆ دەدات، سەرکەوتوو کاتە بەتاڵەکانی بەکار دەهێنێت بۆ فێربوونو فێرکردن.

١٥. دۆڕاو وا دەبینێت ئاسۆی ئاینده نادیاره (ڕەشبینە)، سەرکەوتوو وا دەبینێت کە پشوودانو دانیشتن مەترسیدارە.

١٦. دۆڕاو لە ڕابردوودا دەژی، سەرکەوتوو لە ئێستادا دەژیو سوودیش لە ڕابردوو وەردەگرێت.

١٧. دۆڕاو خۆی ناو ناوە بەئەزموونو شارەزا، سەرکەوتوو دەزانێت کە هێشتا زۆری ماوە فێر ببێت.

١٨. دۆڕاو هەمیشە دەموچاوی گرژو مۆنە، سەرکەوتوو هەمیشە ڕووخۆشو دەمبەخەندەیە

١٩. دۆڕاو باوەڕی وایە کە سەرکەوتوو چانسو بەختی هەیە، سەرکەوتوو دەزانێت کە کاری قورسو گران، خۆی چانس دروست دەکات.

٢٠. دۆڕاو بەهانەو گازندەکانی تەواو نابن، سەرکەوتوو بیرو بۆچوونەکانی تەواو نابن.

٢١. دۆڕاو لە هەموو چارەیەکدا کێشەیەك دەبینێت، سەرکەوتوو لە هەموو کێشەیەکدا چارەسەر دەبینێت.

٢٢. دۆڕاو دەڵێت: چارەسەر لەوانەیە هەبێت، بەڵام قورسە سەرکەوتوو دەڵێت: چارەسەر گرانە، بەڵام مەحاڵ نییە.

٢٣. دۆڕاو دەڵێت: فێڵ لە خەڵکی بکە، پێش ئەوەی فێڵت لێ بکەن، سەرکەوتوو دەڵێت: وا مامەڵە لەگەڵ خەڵکیدا بکە، وەك چۆن پێت خۆشە مامەڵەت لەگەڵدا بکرێت.

٢٤. دۆڕاو لە کاردا هەست بە ئازار دەکات، سەرکەوتوو لە کاردا هیواکانی دەبینێتەوە.

٢٥. دۆڕاو لە گفتوگۆدا لاوازەو زمانی توندوتیژە، سەرکەوتوو لە گفتوگۆدا بەهێزەو زمانی نەرمونیانە.

٢٧. دۆڕاو هەڵە بچووکەکان گەورە دەکاتو پابەند نابێت بە بەها باڵاکانەوە، سەرکەوتوو پابەندە بە بەهابەرزەکانەوەو لێبوردەیە لە هەڵە وردو بچووکەکان

٢٧. دۆڕاو ڕووداوەکان دروستی دەکەن، سەرکەوتوو ڕووداوەکان دروست دەکات.



عوسمان حسێن



# ١٠٠ ڕێگا بۆ هاندانی خود

له ئینگلیزییەوە: هەردی محەممەد محەممەدساڵح

ئــەو هەڵبژاردنــەی بۆ خۆمان هەڵــی دەبژێرین، یــان هانمان دەدات، یــان دوورمان دەخاتەوە، لە کاتێکدا ڕوونیی ئــەو ئامانجەی لە ژیانماندا هەیە، یەکەم هەنگاوە، هاندانی خود زۆری پێویســتە؛ بۆئەوەی بەڕاســتی هانی خۆت بدەیت، کردار پێویســتە. وەکوو دەروونناس ناســانیل براندۆن نووســیویەتی: «ئامانج بەبێ کــردار خەونی ڕۆژانەیــە». داهێنانی خود کاتێك ڕوو دەدات، کە هاندانی خود ڕێك بخرێت. هەریەکەیان لەوی تر ەوە ڕاستەوخۆ وەردەگیرێت. هەست، خود درووست دەکات.

**درووســتکردنی تێڕوانیــن:** دەتەوێــت ببیت بەچیو بــژی لە ناو ئەو وێنەیــەدا وەك ئەوەی کە ڕاســت بێت. ئەمە وەك ئەوە نییە بوەســتیت، هەتا پێی دەگەیت بە ڕوئیاکەت. واتە: دەتوانیت ئێستا دروستی بکەیت.

درۆیەکی ڕاســت بڵێ: خەیاڵی ئەو ئەگەرانە بکە لە خۆتدا. دەست بکە بە وتنی ئەگەرە باشەکان، بەبێ وێنەی خۆت لە بەرزترین حاڵەتی خوددا، ناتوانی لەو حاڵەدا بژیت.

**شــوێنە ئارامەکەت جێ بهێڵە:** تەنها تەحــەددا کە تۆ تاقی دەکاتەوەو باشتر درووستت دەکات، تەنها تەحەدداو هاندانی خود، تۆ بەرەو تەحەددا دەبــاتو بەڕاســتی تــۆ دەگوازێتەوە. ئەوە بەدەســتی تۆیە کــە تەحەددا دەدۆزیتەوە، بە دەســتی خۆتە کاتێك دەزانیــت بە زیندوویەتی دەتخەنە چاڵ لە زۆنی ئارامدا. بە ئاسانی بشکێنەو بفڕە.

**کلیلی سەرکەوتنەکانت بدۆزەرەوە:** درووستی بکە (درووستی بکەرەوە) بیرکردنــەوەت، بیرکردنەوە لە دوای بیرکردنەوە، بە کردارێکی وزەدارەوە لە جیاتی نادیار، ناپلیۆن هیل لە کتێبە بەناوبانگەکەیدا (کلیلی سەرکەوتن بۆ دەوڵەمەندی) دەڵێت: "خۆڕێکخســتن پێویستە بۆ یارمەتیدانی تەواوو تەواوکردنی شــوێنەکانی مێشــکت". تەنها شــتێك کە بتوانیت کۆنترۆڵی بکەیت بەتەواوی، شێوازی بیرکرنەوەی خۆتە.

**پلان بــۆ کارەکانــت:** دەتوانیت شمشــێرەکەت لە کێــلان دەربکەیتو خۆت تووشــی ناڕەحەتی بکەیت، ئەگەر کردار ئەنجام بدەیت. برۆ. بیکە. بجوولــێ. بەردەوامییەکانت هەڵبســەنگێنەو هەڵەکانت چاك بکەرەوە، کە پێویســتی کــرد، بەڵام بــەردەوام بە. پلانــی ڕوون بــۆ کار، ڕێگایەکە بۆ هاندانــی خودو وزەی تێدایە بۆ مەبەســتەکە. یەك کاژێر بۆ پلان، ســێ کاژێــر کاتــی کارکردنت بۆ دەگەڕێنێتــەوە. زۆرێك لە ئێمــە کاتەکانمان بەســەر دەبەین لەگەڵ کاردانەوە بــۆ قەیرانەکان، زۆربەی قەیرانەکان لە ئەنجامی بێ پلانییەوە درووســت بوون. ڕێك ناکەوێت قەد کە کەسێك بە هێــزەوە کارەکانی ئەنجام بداتو مەبەســتێکی ڕوونــی هەبێت، لە هەمان کاتــدا بێتاقەت بێت. پلانی ســەرکەوتوو، وات لــێ دەکات کە کاری زیاتر بکەیتو زیاتر لەوەی کە بیری لێ دەکەیتەوە.

**ئامانجەکــەت بجووڵێنە:** تــۆ لەوانەیە ئەوانەت دەســت نەکەوێت کە دەتەوێت ئەگەر ئامانجەکەت بچــووك، یان ناڕوون بێت؛ چونکە ناڕوونی لــە ئامانجدا وات لــێ دەکات، هێزت کەم ببێتەوە، خۆشــحاڵ نەبیت بەو کارەی دەیکەیت "ئامانجی کاریگەر ئەو ئامانجەیە کە تۆ ئاڕاستە دەکات". بــە بوونی ئامانجێکی بەهێز، تۆ لە ژیانێکی مەبەســتداردا ژیان دەبەیتە سەرو دەزانیت چ کارێك دەکەیت لە ژیانتدا، پاشان کاریگەریی ئامانجەکەت دەبینی لەســەر ژیانت. واتە: ئەوە گرنگ نییــە ئامانجەکەت چییە، ئەوە گرنگە ئامانجەکە چیت بۆ دەکات.

**تۆپەکە بە دەســتەکەی ترت بجووڵێنە:** بــە جۆرێکی تر داری لێدانی تۆپەکــە بجووڵێنە، شــوێنەکەت بگۆڕە بۆ لێدانی، مانــای وا نییە ناتوانی ئــەوکارە بکــەی؛ چونکــە تاقیــت نەکردووەتــەوە. دووبــارە پرۆگرامی بیرکردنەوەت بکە، وەك لێدانی تۆپێك. گەشــبینانە بیر بکەرەوە لە یەك شــت، لە یەك کاتدا، پاشان چەند لێدانێك، ئەنجام بدە؛ تا دەبێتە خوو و خیبرەیەکی کاریگەر.

**کەسێتیی خۆت بەکار بهێنە:** چۆن کردار بکەیت؛ دەبیت بەو کەسە.

**تەنها هەندێك شت مەکە، دابنیشە لەوێدا:** بێدەنگ دابنیشە، بە تەنها، بۆ ماوەیەکی زۆر، هەر بەتەنها، پشــوو وەربگــرە، بەئارامی، بەبێ ئەوەی کەس ئارامییەکەت لێ تێك بدات، لەگەڵ خۆتدا بە. تێڕوانینەکانت دەست بەدەرکەوتــن دەکــەن. پەیوەندیی خــۆت لەگەڵ خۆتدا ببینە، دانیشــتن لــە بێدەنگیدا یارمەتیت دەدات بۆ خەونی ڕاســتەقینە لە ژیانت، پاشــان دیاریکــردنو ڕوونکردنــەوەی خەونەکە. لەم جیهانە پــڕ خێراییەدا، یان دەژیت بۆ خەونو ئامانجی خۆت، یان بۆ کەسێکی تر. ئەگەر تۆ بنەمایەك درووست نەکەیت بۆ ژیانت؛ ئەوا دەبێت لەسەر بنەمای کەسێکی تر بیت (مۆریس بۆڵەت)، مەگەر کاتو شــوێنی پێویســت بــۆ خەونەکەت دیاری بکەیتو کاری پێ بکەیت.

**زانیاری لەسەر لایەنی کیمیایی لاشە:** کاتێك کە خۆشحاڵ دەبیت؛ ئەوا هەســتەکانتو وزەو توانات زیاد لە پێویســت زیاد دەکات، بزانەو بدە لە لایەنی باشــی گۆڕانکاری خۆت، کاتێك پێدەکەنیــت، گۆرانی دەڵێیت، یان باوەش بە کەســێکدا دەکەیت. مەچۆ دەرەوە بۆ گەڕان بەدوای سەرچاوەی خۆشــیدا، ئەو ســەرچاوانە لە ناخێ خۆتدایە. کاتێك کارێك، یان ئەرکێك کــە حەزت پێی هەیە، درووســتت کرد لە ژیانتدا؛ ئەوا کێشــەی هاندانی خودت چارەسەر کردووە.

Ways to Motivate Yourself by Steve Chandler ١٠٠



ئەکرەم ئەحمەد

# ١٠ ڕێنمایی بۆ هەڵسوکەوتێکی جوان

١. بەهێزکردنو خۆشەویستکردنی ئامۆژگاریی ئایینی لە دڵی منداڵاندا.

٢. نەبین بە هاندەر لەسەر جنێودانو لێدانی برا بچووکو گەورەکانیان.

٣. دەبێت بەیەك چاو، سەیری هەموویان بکەین، مامەڵەیان لەگەڵدا بکەین.. لە مادەدا بەپێی ئاستو پێویستی تەمەنیان، پێدانو پارەی ڕۆژانەیانو کڕینی جلوبەرگو پێداویستییانو هەندێجار گرتنەوەی پارە لێیان وەك سزایەك بەرامبەر ئەو سەرپێچییەی ئەنجامیان داوەو هەندێك جار دیارییان پێشکەش بکەین بەرامبەر بەو کارە باشەی کە ئەنجامی دەدەن.

٤. ڕێنماییان بکەین لە دیاریکردنی هەڵەو ڕاستەکان، هەوڵیان لەگەڵدا بدەین، بە ئامۆژگاریی جوان هەڵەکانیان پێ دەربخەینو خۆیشیان چارەسەری هەڵەکانیان بکەن، لەژێر ڕێنمایی دایكو باوکدا.

٥. با منداڵەکانمان نەخرێنە بەردەم چەند هەڵوێستێکی گاڵتەجاریو پێکەنینو کاتبەسەربردندا.

٦. پێویستە کەلوپەلی منداڵەکانمان بپارێزین، تا لە ڕێگای ئەو پاراستنەوە، فێری واتای بەخاوەنکردنو خاوەندارێتی بن.

٧. دەبێت تۆوی چاکە لە ناخیاندا بڕوێنینو تۆوی خراپەش لە ناخیاندا بنبڕ بکەین.

٨. سنووردارنەکردنی جووڵەو چالاکییەکانیان، کارکردن بۆ قۆستنەوەی وزەی منداڵەکانمان بە چەند کارێك، کە بەقازانج بگەڕێتەوە بۆیان، وەك: ئەنجامدانی چالاکیی هونەریو پیشەییو هەندێك یاریی زەینی کە توانای هزریان گەشە پێ بدات.

٩. هەستکردنیان بە خۆشەویستیو ئاسایشو سۆزو چاودێری لەلایەن دایكو باوکانەوە، کە ئەمەش بۆ منداڵەکانمان سوودبەخشە.

١٠. بۆنەی پشوو لەگەڵ جەژنەکاندا، بکەین بە وێستگەی حەوانەوە بۆ منداڵەکانمان، ئەویش بە گەشتکردن بۆ دەرەوەی گەڕەكو ناوچەو شار، کە ئەم دەرچوونە هۆکاری حەوانەی دەروونو هزریانەو بە سوودو قازانج دەگەڕێتەوە بۆیان.



# سیکیرو هۆندا

# (١٩٠٦ - ١٩٩١)

بەرزان ئەبوبەکر

کۆمپانیای هۆندا بە درێژیی مێژوو، سەلماندوویەتی کە لەسەر بنەمایەکی بەهێزو درووست بنیات نراوە، بەشێوەیەکی بەرچاو، بەشداریی کردووە لە پارێزگاریکردنی ڕەزامەندیی کڕیارەکانی، هەمیشە هەوڵی داوە کڕیارەکانی ڕۆژ لە دوای ڕۆژ متمانەی زیاتریان بە هۆندا هەبێت.

کەواتە: کێ کۆمپانیای هۆندای درووست کردووە؟ کێ بنەماو یاساو ڕێسای بۆ داناوە؟

سۆیچیرۆ هۆندا لە خێزانێکی زۆرهەژار لە ناوچەی هاماماتسوی دوورەدەست، لە وڵاتی یابان لە بەرواری ١٩٠٦/١١/١٧ لەدایك بووە، سۆیچیرۆ لە خێزانێکی زۆر هەژار بوو، سەرەڕای هەژاریو نەبوونیان، پێنج برای بەهۆی بەدخۆراکیو نەبوونی سەرچاوەی داراییو مرۆیی، کۆچی دواییان کرد، باوکی هۆندا، ئاسنگەرێکی هەژار بوو، کاری چاککردنی پاسکیلی هەوایی بوو، لەسەر ڕێگەو بانەکان، ئەم وێستگەیەی ژیانی کە تێیدا دەژیا، هۆکار بوو، بۆئەوەی زۆر هۆگری پاسکیل بێت، هەروەها ئامۆژگاریو ڕێنماییەکانی باوکی زۆر یارمەتیدەری بوون لە ژیانی کردەییدا.

سۆیچیرۆ هۆندا خوێندکارێکی شکستخواردوو بوو، هەمیشە لە دەست ئەرکەکانی قوتابخانە هەڵدەهاتو خۆی دەدزییەوە، ئەو هەمیشە بۆ خۆدزینەوە لە ئەرکەکان، ڕەخنەی ئاڕاستەی یاساکانی خوێندنو شێوەی وانەوتنەوە دەگرت، هەمیشە حەزی بە فێربوون بوو بە شێوەی کردەیی، بەتایبەت ئەزموونو هەڵەکردنو چاککردنەوەی، ئەوەی بە ڕێگەی فێربوون ئەژمار دەکرد.

سۆیچیرۆ هۆندا عاشقی ئۆتۆمبێلو ئامێرەکانی بوو، لەوبارەیەوە دەیگوت: تووشی شۆك بووم، کاتێك لەبەردەم یەکەم ئۆتۆمبێلدا وەستامو یەکەم بەرهەمی خۆمم بینی، وام دەزانی ئەو ساتە لەدایك بووم، ئەوە منم خاوەنی بیرۆکەی داهێنانی ئۆتۆمبێلو دیزاینی ئۆتۆمبێلم، لەگەڵ ئەوەشدا ئەو کات من کەسێکی شکستخواردوو بووم لە قوتابخانە!

سۆیچیرۆ هۆندا لە ساڵی ١٩٢٢ وازی لە قوتابخانە هێنا، ئەو کات تەمەنی ١٦ ساڵان بوو، پاشان گوندەکەی خۆیانی بەجێ هێشتو ڕووی کردە تۆکیۆ، دەستی کرد بە کارکردن لە شوێنکارێکی چاککردنەوەی ئۆتۆمبێل، ماوەی شەش ساڵ لەو شوێنکارە کاری کرد.

پێش ئەوەی برێك پارە قەرز بکات؛ بۆئەوەی یەکەم شوێنکار بکاتەوە بۆ چاککردنی ئۆتۆمبێل لە ساڵی ١٩٢٨، فێری زۆر شت بوو.

هەمان ساڵ سۆیچیرۆ هۆندا بڕوانامەی داهێنانی بۆ دیزاینی سلێکتەرو کەلوپەلی ئۆتۆمبێل وەرگرت، دوای ئەوەی لە دار درووستی کردبوو، ئەم بیرۆکەیە سەرەتای جیهانی داهێنان بوو، کاتێك زیاتر لە ٤٧٠ داهێنان تۆمار کرا، زیاتر لە ١٥٠ بڕوانامەی داهێنان کرا بەناویەوە.

هۆندا لە ساڵی ١٩٣٨ دەستی کرد بە درووستکردنی یەکەم دیزاینی بانسی ئیستۆپ (piston rings)، لە ڕێگەی کارکردنی لە شوێنکاری چاککردنی ئۆتۆمبێلەوە، لە کۆمپانیای تۆیۆتا لە یابان، هۆندا کارگەیەکی بچووکی بۆ ئەم کارە دامەزراند، بەڵام قومبەلەیەك بەر کارگەکە کەوتو لە کاری خست، ساڵی ١٩٤٥ کارگەکە بە تەواوی وێران بوو لە ئەنجامی بوومەلەرزەیەکی بەهێز، هۆندا دوچاری خەمو بێهیواییو ترس بوو، دوای ئەوەی تەواوی کەلوپەلەکانی هەموو شتەکانی چواردەوری بە تەواوی لەناو چوو.

پیاوە ئازاکان هەمیشە بە لێدانە سەختەکان بەهێزتر دەبن، بەڵای دڵکوت کۆتایی هات، بۆ جاری دووەم هۆندا لەسەر پێی خۆی ڕاوەستایەوە، دوای ئەوەی چووە نێو بازاڕی ماتۆڕسکێلەوە، هۆندا دەیناڵاند بەدەست نەبوونی بەنزینەوە، نەیدەتوانی ئۆتۆمبێل لێ بخوڕێت، ژیریو لێهاتوویی هۆندا یارمەتیی دا بۆ بەستنی پاسکیلێکی هەوایی، بە مۆتۆڕێکی بچکۆلە، کە بووە یەکێك لە مۆتۆرە سوودبەخشەکان، کە بە شلەمەنییەك کاری دەکرد کە بە ئاسانی دەسووتا، کە ئەو کاتە ئەو جۆرە شلەمەنییە زۆر بووە، ئەم ڕێگەیە زۆر باشو عەنتیکەو گرنگ بووو بۆ هۆندا.. هاوڕێکانی بە داهێنانەکەی زۆر سەرسام بوون، لەبەرئەوە داوایان لێ کرد کە ١٢ مۆتۆڕسکێلی هاوشێوەیان بۆ درووست بکات، ئیدی لێرەوە هۆندا دڵنیا بوو لەوەی کە بازاڕێکی گەورەی بۆ داهێنانەکەی دۆزیوەتەوە.

هۆندا لە ساڵی ١٩٤٨ کۆمپانیایەکی دامەزراند بەناونیشانی (کۆمپانیای هۆندا) کە خاوەنی بڕوانامەی داهێنان بوو لە درووستکردنی مۆتۆڕسکیلدا.

یەکەم درووشمی بانگەشەکەی بریتی بوو لە: (چاوت بە نەرمونیانترین کەس دەکەوێت، کاتێك مۆتۆڕسکیلی هۆندای لێ دەخوڕیت).

هوندا مۆدێلی یەکەمی پێشنیاز کرد، (D)، کە بە مانای (خەون) دێت، پاشان لە ساڵی ١٩٥١، مۆدێلی (E) پێشنیاز کرد، کاتێك مۆدێلی (The super cub) بەرەوپێشچوو، لە ویلایەتەیەکگرتووەکانی ئەمریکا، لە ساڵی ١٩٥٨ هۆندا گەورەترین کارگەی درووستکردنی مۆتۆڕسکێلی کردەوە لە وڵاتی یابان، لە کاتێکدا زیاتر لە ٢٥٠ ڕکابەری هەبوو، کە (٥٠) دانەیان یابانی بوون، بەڵام مۆدێلی (super cub) توانی سەرنجی زۆرێك لە هەرزەکارانو کچان بۆ لای خۆی ڕابکێشێت، ئەویش بە هۆی کوالێتی بەرزی مۆتۆڕسکێلەکانییەوە، ئەم مۆدێلە سەرکەوتنێکی گەورەی بەدەست هێنا، لە ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا، بەتایبەت دوای ئەوەی ڕیکلامێکی سەرکەوتوویان بۆکرد، (چاوت بە نەرمونیانترین کەس دەکەوێت، کاتێك مۆتۆڕسکیل لێ دەخوڕیت)، خەڵکی پاسکیلی بیر چوویەوە بە هۆی مۆتۆڕسکێلەوە. کە لە داهێنانو بیرۆکەی هۆندا بوو. نرخی مۆتۆڕسکێلەکان گونجاو بوو، هەروەها زۆر تۆکمەو باشبوون، ئەوەش بووە هۆی ئەوەی ملیۆنان کەس هان بدات لە هەموو تەمەنەکان، بۆ کڕینی مۆتۆڕسکێلی هۆندا، دوای ئەوەی سەرەتا بەس سەرنجی دەوڵەمەندەکانی بۆ لای خۆی ڕاکێشا.

سەرەتای گەشەسەندنی کۆمپانیای هۆندا، دەگەڕێتەوە بۆ ساڵی ١٩٦١،

ئـەو کاتەی دەسـتی کرد بە ناردنی ١٠٠٠٠٠ سـەد هەزار مۆتۆرسـکیل بۆ ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا.

هۆندا بەردەوام بوو لە درووسـتکردنی مۆتۆرسکیل تا ساڵی ١٩٦٨ کۆی مۆتۆڕە نێردراوەکانی هۆندا بۆ ویلایەتەیەکگرتووەکانی ئەمریکا، گەیشـتە یـەك ملیـۆن مۆتۆڕ. هۆنـدا لە گەشەسـەندن بەردەوامە، لە ناوەڕاسـتی هەشتاکاندا، کۆمپانیای هۆندا لە ٦٠٪ پشکی بازاڕی وەرگرت.

* سـاڵی ١٩٩٠ هۆندا توانی ساڵانە ٣٠٠٠٠٠٠ سێ ملیۆن مۆتۆر هەناردە بکات، بەمەش هۆندا لە جیهانی مۆتۆڕدا خەونەکەی بەدی هات، مۆتۆڕەکان گەیشـتنە دەسـتی هەمـوان، بەوەش توانـی بەتەواوی بـازاڕی ئۆتۆمبێل بشکێنێت.

* سـەرکەوتووەکان هەمیشـە بیر لە لوتکەو گەیشتن بە سەرکەوتنی زیاتر دەکەنەوە، هۆندا تەنها لە درووستکردنی مۆتۆرسکیلدا خۆی قەتیس نەکرد، بەڵکوو هیواو ئاواتی زیاتری هەبوو، هەر لەبەر ئەوە، شانبەشـانی جیهانی مۆتۆڕ، ڕۆیشـتە نێو جیهانی ئۆتۆمبێلەوە، سـەرەتا لە ساڵی ١٩٦٢ هۆنـدا چووە نێو جیهانـی ئۆتۆمبێلەوە، سـەرەتای کارکردنی بە دیزاینی ئۆتۆمبێلی پێشبڕکێ دەستی پێکرد.

هەرچەنـدە وەزارەتـی پیشەسـازیی یابانی دژایەتی دەکـرد، بەهۆی زۆربوونی کارگەی درووستکردنی ئۆتۆمبێلەوە لە وڵاتی یابان.

بەڵام هۆندا گوێی پێ نەدا، هەروەك چۆن هەموو شکستەکانی سەرەتا فەرامـۆش کردبوو، هەرواش بۆچـوونو دژایەتیی وەزارەتی پیشەسـازیی فەرامۆش کرد، هۆندا بەتەواوی ساڵی ١٩٧٠ چووە نێو بازاڕی ئۆتۆمبێلەوە، پێش ئەو لە سـاڵی ١٩٢٥ کەس لەو بوارەدا سـەرکەوتوو نەبوو، بە چوونی کرایزلـەر بـۆ نێو بازاڕی کار.. ئـەو کات زیاتر لە ١٠ کۆمپانیا شکسـتیان هێنابوو لەو بوارەدا، بە دیزاینی هۆنداو چوونە نێو بازاڕەوە توانی دەست بەسەر بازاڕدا بگرێتو سەرکەوتنێکی جیهانی بەدەست بهێنێت.

هۆندا کە چووە نێو بازاڕەوە، دەسـتی خسـتە سـەر خاڵە لاوازەکانی بازاڕ، لەبەرئەوە دەستی کرد بە بەرهەمهێنانی مەکینەیەك، کە پارێزگاری لـە ژینگە بـکات، بە پێی ئەو مواسـەفاتەی حکوومەتـی ئەمریکی داوای کردبـوو، هیـچ کام لـە کۆمپانیـا زەبەلاحەکانـی بواری درووسـتکردنی ئۆتۆمبێـل، وەکـوو (جەنەراڵ مۆتۆرز، فـۆرد، کرایزلەر، تۆیۆتا، نیسـان، مارسـیدس بینز، بی ئێم دەبلیو، پۆرشن) سەرکەوتوو نەبوون لە داهێنانی ئەو جۆرە مەکینەیەدا! هۆندا هەموانی شەرمەزار کرد، بە داهێنانی یەکەم مەکینە کە بەرهەڵستی پیسبوونی ژینگەی دەکرد، واتە: ژینگەی دەپاراست، (CVCC)، یەکەم ئۆتۆمبێلی بە مەکینەی نوێوە ساڵی ١٩٧٥ پێشنیاز کرد، بە ناونیشـانی (CIVIC)، واتە: شارستانیەت، یاخود ئۆتۆمبێلی شارستانی، کە لە بازاڕەکاندا، سەرکەوتنێکی دیارو بەرچاوی بەدەست هێنا.

هۆنـدا بە سـتراتیژی نـوێ بەردەوام بوو، (ئاسـانو ئاسـتەم) کە لە درووستکردنی مۆتۆڕسکیلدا بەکار دەهێنا..

هونـدا بوو بـە کۆمپانیایەکی دیـارو بەرچاوو پێشـکەوتوو، ئەوەش بووە هـۆی ئەوەی خۆشەویسـت نەبێت لای کۆمپانیاکانـی دیکەی بواری درووسـتکردنی ئۆتۆمبێل، بە تایبەت دوای قەیرانی بەنزین لە ساڵی ١٩٧٤، کارگەکانی درووسـتکردنی ئۆتۆمبێل لە یابان بڕیاریان دا نرخی ئۆتۆمبێل بـەرز بکەنەوەو بەرهەم کەم بکەنـەوە، تاکە کۆمپانیا کە ئەم بیرۆکەیەی ڕەت کردەوەو دژایەتی کرد، هۆندا بوو، هەمان ئەو کارەی کە هێنری فۆرد پێـش پەنجا سـاڵ لەوەو بەر کردبووی، وەکـوو بەرپەرچدانەوەی بڕیاری کۆمپانیاکانـی ئۆتۆمبێـل، هۆنـدا بەرهەمی بەرز کردەوە بـۆ دوو هێندە نرخیشـی دابەزاند، بڕیارەکـەی هۆندا جێگەی خۆی گرتو سـەرکەوتوو بـوو، بەو بڕیارە فرۆشی کۆمپانیای نیسـانو تۆیۆتا بۆ لـە ٤٠٪ دابەزی، لەبەرامبـەردا فرۆشـی کۆمپانیـای هۆندا بـۆ لە ٧٦٪ زیادی کـرد، هۆندا بەردەوام بو لە سەرکەوتن.

ساڵی ١٩٨٣ هۆندا بووە خێراترین کۆمپانیای گەشەسەندوو لە جیهاندا، هۆندا لەسـەر دەستی منداڵێك کە ناسرابوو بە (بلایبوی هاماتسو) پێش ئـەوەی هاوسـەرگیری بکاتو خـودا دوو کوڕو دوو کچی پێ ببەخشـێت) دامەزراو گەشـەی کرد، لە ناو کارمەندەکاندا بە زریان ناسـرابوو؛ چونکە زۆر توڕە دەبـوو، ئەگەر یەکێك لە کارمەندەکان کارێکی نەزانانەو هەڵەی بکردایە. هەرچەندە کارمەندەکان خۆیان لە توڕەبوونی بەدوور دەگرت..

ئەو هەمیشـە بە کارمەندەکانی دەگوت: ئەو ڕەوڕەوە ڕاسـتەقینەیەی تایەی پێ درووست دەکەیت.. ڕەوڕەوەی مێشکتە.

ئەو توێژەرێك بوو لە هەموو شتێکدا بەدوای کەمالدا دەگەڕا، تەنانەت لە خودی خۆشیدا، هەروەها لە داهێنانەکانیدا.

ئەو کەسـێکی بێئارام بوو، بـەڵام هەوڵدەرو تێکۆشـەر بوو، خاوەنی لێبڕانێکـی بێوێنـە بـوو، زۆر کەم تـوڕە دەبوو، بۆ هیـچ گرفتێك خۆی بە دەسـتەوە نەدەدا، دژی لاسـاییکردنەوە بوو، لە بنەماو بیروباوەڕەکانی هەمیشە نوێبوونەوەو داهێنان بوو، هەڵەی بە بەشێك لە پێشکەوتن دەزانی، لە بەناوبانگترین وتەکانی کە بە هۆیەوە لە زانکۆی میچیگان تەکنەلۆجی بڕوانامـەی دکتـۆرای پـێ وەرگرت: (کاتێـك بۆ دواوە دەڕوانین، هەسـت دەکـەم کە دەسـتکەوتەکانم هیچ نین، تەنها چەنـد هەڵەیەكو کۆمەڵێك کاری شکسـتخواردوو، لە زۆربەیان پەشیمانم!، بەڵام شانازی دەکەم بەوەی بەدەسـتم هێناوە، هەرچەندە من کۆمەڵێك هەڵـەم ئەنجام داوە، یەك لە دوای یەك، بەڵام هیچ کات هەڵەیەك، یان شکسـتێکم دووبارە نەکردۆتەوە، لەبەرئەوە دڵنیاتان دەکەمەوە، کە سەرکەوتن لە کارەکانمدا لە ١٪ بووە، لە ٩٩٪ ی کارەکانیشم شکست بووە!).

هۆنـدا کارمەندانـی هان دەدا کە توێژینەوەی زانسـتی ئەنجام بدەن، بەرهەڵسـتی هەر هەوڵێك بکەن کە کۆمپانیاکەیان بەرەو ئاقاری ڕۆتینیو لاسـاییکردنە دەبات، لـە لێدوانێکی بۆ ڕۆژنامەی (نیـۆرك تایمز)، گوتی: حکوومەتەکەی ئێمە، بەرگری لە بەرژەوەندیی گشـتی دەکات، بەڵام کاتێك دەمانەوێـت شـتێکی نـوێ دابهێنین بەربەسـت دەخاتـە بەردەممان، من دژی بەڕێوەبردنـی کـۆنو تەقلیدیم، بڕوام وایە کـە کارمەند دەتوانێت بەشێوەیەکی باشتر کارەکانی ئەنجام بدات، ئەگەر حەزو ویستی هەبوو بۆ کارەکەی، بە بەراورد بەو کارمەندەی بەردەوام فەرمانی پێ دەگات کە پێی هەڵسێو ئەنجامیان بدات، زانایانی دەروونناسی، هەروەها زانستی کارگێڕی نوێ، ئەم قسەیان پشتڕاست کردۆتەوەو سەلماندوویانە.

یەکەم خۆخسـتنە نێو مەترسـی هۆندا، ئەو کاتە بوو کە ئۆتۆمبێلی پێشـبڕکێی لێ دەخوڕی، لە میانی پێشـبڕکێیەکدا بە شێوەیەکی شێتانە، ئەو وا گومانی برد لە یەکێك لەو پێشـبڕکێیانەی دەیباتەوە تیا دەچێت، گەیشـتە هێڵی کۆتایی هەرچەندە ئۆتۆمبێلەکەشـی تێك شکا، ماوەی سێ مانگیش لە نەخۆشـخانە مایەوە، پزیشکەکانی ئامۆژگارییان کرد کە دوای ئەو ڕووداوە بەشداری پێشبڕکێی ئۆتۆمبێل نەکات، لەگەڵ ئەوەشدا کاتێك تەمەنی گەیشتە ٦٠ ساڵی خۆی فێری لێخوڕینی هێلیکۆپتەر کرد.

هۆندا ڕکابەرێکی سەرسـەخت بوو، هەرگیز دانی بە شکسـتدا نەدەنا، هەمیشە ئەگەر قەناعەتی بە بیرۆکەیەك هەبووایە، ئامادەبوو بۆ خۆخستنە نێو هەموو مەترسییەکەوە، لەوانە بڕیاری دابەزاندنی نرخو بەرزکردنەوەی بەرهەم لە میانی قەیرانی ئۆپیك لە ناوەڕاسـتی حەفتاکاندا، ئەوە کارێکی پاڵەوانانە بوو، ئەگەر بڕیارە ڕاستو درووستەکانی ئەو ڕۆژە نەبووایە، ئەوە هۆندا بەبادا دەچوو، نەدەبووە ئەو کۆمپانیا زەبەلاحەی ئێستا.

چیرۆکێکـی دیکە لە گیانی کێبەرکێـی لای هۆندا، ئەو بڕیارە بوو کە ڕۆیشـتنە نێو بـازاڕی ئۆتۆمبێلەوە، هاوکات کۆمپانیـای (یاماها) ڕکابەری هۆندا بوو لە بازاڕی درووستکردنی مۆتۆرسکیلدا، هەلێکی باش بوو بۆئەوەی بە ئاسـانی بەسەریدا سەر بکەوێت، بەتایبەت ئەو ڕۆژانەی هۆندا بەدەست لایەنی داراییەوە دەیناڵاند، یاماها بۆ ئەم مەبەستە نرخی دابەزاند، مۆدێلی نوێی خسـتە بازاڕ؛ چونکە لەوە دڵنیابوو کە سـۆیچیرۆ هۆندا سـەرقاڵی درووستکردنی ئۆتۆمبێل بوو، بەڵام هۆندا بە هەموو هێزییەوە بەرپەرچی ڕکابەرەکانـی دەدایـەوەو وەکـوو ئەوەی لـە جەنگدا بێت، تـا ئەو ڕۆژەی ماڵاوایی لە ژیان کرد ڕکابەری سەرسەختی هەموانی دەکرد.

# ڕۆح خاڵییەو جەستەش بێئاگا!

شۆخان علی

خـۆراك، هۆكارێكی گرنگی زیندوومانـەوەی بوونەوەرە، بەڵام كام خـۆراك؟ ئایا هەرگیز بیر لە چۆنێتیو چەندێتیی خۆراكەكان دەكەینـەوە؛ تا ئاگاداری چۆنێتـیو چەندێتیی ژیانمان بین؟! لێت ڕوونە كە، مرۆڤو هەمـوو بوونەوەرانی تر بەهۆی خۆراكەوە وزە وەر دەگـرن؛ ڕووەك لە(ئـاوو تیشـكی خۆر)، ئـاژەڵ (هەندێكیان گۆشـتخۆرو هەندێك گیاخـۆر)، بەڵام لێرە مـرۆڤ جیایە! مرۆڤ ڕۆحی هەیەو جەستە، كە هەردووكیان پێویستیان بە خۆراك هەیە.

بیرمە لە منداڵیدا، هەمیشە پێیان دەوتین، ئەگەر نان نەخۆن گەورە نابن، یان ئەگەر نان نەخۆن دەمرن! بۆیە هەمیشە هەوڵمان دەدا بخۆیـنو گەدەمان تێر بكەین؛ بۆئەوەی لەو بەڵایانە بەدوور بین، بـەڵام هەرگیز پێمان نەدەگوترا، ئەگەر ڕۆحتان تێر نەكەن چیتان لێ دێ، ئەگەر بیركردنەوەتان باش نەبێت چ كارەسـاتێك دەقەومێ! بۆیە ئێمەش هەرگیز بیرمان لەوە نەدەكردەوە گرنگی بـە ڕۆحو بیرمان بدەینو فێر ببین چـۆن خۆراكیان پێ بدەین! دڵنیـام ئەمە دەردی زۆر بەمانە بە ئێستاشـەوە، مخابن! هەموو خەڵكـی ئەوەندەی بـەدوای تێركردنی جەسـتەیانن، نیو هێندە بەدوای ڕۆحو بیریانەوە نین!

چونكە مـرۆڤ كـە گـەدەی تێر بـوو چیتر بیـرو ڕۆحی ماندوونو چالاك نابن، هەتا ئەو خاڵی دەبێتەوە؛ چونكە بیریش بە گەدەوە سـەرقاڵ دەبێـت، ئەوكات ڕۆح بەتەنهـا دەمێنێتەوە! چەند سـەیرە هەمیشـە مرۆڤ گرنگی بە شتە فانییەكان دەدات، لەجێی نەمرەكان! سـەرنج بدە! ئەو منداڵانەی لەسـەر شـەقام دەسـووڕێنەوە؛ دەیانەوێـت نانێـك پەیـدا بكەن؛ تا لە شـەڕی برسێتیدا سەركەوتوو بن. دەبینی هەموو ڕۆژ هەمان كار دووبارە دەبێتەوە، تەنانەت ئەگەر نانێكیشیان چنگ نەكەوێت، یان ئەگەر تانەشیان لێ بدرێت! بۆچی؟ ئەی بۆ ناكرێت تاوێ خۆی بە بەها ڕۆحیەكانەوە سـەرقاڵ بكات، تا هەسـت بە ماندوویێتی جەستەی بیـر بچێتەوە. بۆچی فێر ناكرێت كاتەكانی دابەش بكات بەسـەر ڕۆح جەسـتەیدا، نـەوەك جەسـتەی كاتەكانی ڕۆحیشـی داگیر بـكات! مەگـەر خراپە تا ئـاگاداری لایەنی ڕۆحـی بین؟ زەرەری هەیـە ئەگەر بهێڵین كەمێك گەدەمان پشـوو بدات؟ دیارە كە نا، بەڵكوو ئاسـوودەیی ڕۆح سـەرچاوەی ئاسـوودەیی بیرو جەستەو هیلاكی ڕۆح سەرچاوەی هەموو بەڵایەكە، بەڵام بۆ ئێمە هەمیشە وا هەست دەكەین، كاتەكان بەشی تێركردنی جەستەمان ناكەن؟

بۆچـی دەبێت هەموو هەوڵێكمان لەسـەر ئـەو ئامانجانە زەق بكەینـەوە، كـە لـە ڕووی مادییـەوە دەوڵەمەنـد ببین؟ چونكە وا فێركراوین ئەگەر تێر نەبینو برسـی بین، نەتوانین بژیـن! ڕۆژانە بـە ملیۆنان تەن خۆراك سـەرف دەبێت، بەڵام كتێبخانەكان ئەگەر كتێبێكیان لێ بڕوات، مایەی خۆشـحاڵییە! چ كارەساتێكی تۆقێنەرە، كە بەهای ڕۆح بخرێتە دوای خۆراكو خـەو! چ دنیایەكی بناغە پووچەڵ دەبینـم، كە خەڵكی بەبێ ڕۆح بە شەقامەكاندا گوزەر دەكەن!

بەڵام ئەگەر بێ فیكرو ڕۆح بینو لەگەڵ ڕۆبۆتێك جیاوازیمان نەبێت، ئاسـاییەو ژیـان هەر دەڕوات! نا ئیتر گـەورە بووین؛ با خۆمـان ئاگاداری خۆمان بینو بزانین كـە ئەم هەموو هیلاكەتە خەتای تێربوونی گەدەو خاڵیتیی ڕۆحو مەعنەوییەتمانە. با چیتر هەوڵ بدەین، ئەوەندە ڕۆحمان نەتۆرێنینو تا كات هەیە ئاشـتی بكەینـەوە؛ بۆئەوەی لـە جوانییەكانی ژیان بێ هەسـت نەبینو لـە لەزەتی مەعنەوی بێبـەش نەبین... چیتر پێویسـتە بزانین كە خۆراكی جەسـتە پێویستەو خۆراكی ڕۆح پێویستتر. ئاگاداری تەندرووستی ڕۆحمان بینو لە نەخۆشی بیپارێزین!

پێویسـتە وریا بین، كە ڕۆحمان ڕۆژ بە ڕۆژ گەورەتر بكەینو گەدەمـان بچووكتر، نەوەك گەدەمان بەشـێوەیەك گەورە بكەین، كە هەموو تەركیزێكمان تەنها ئەو بێت! پێویستە ئاسوودەییەكان بۆ ڕۆحمان بگەڕێنینەوە؛ ئەگەر ڕۆحەكان ئاسوودەبوون، ئەوكات هەموو دونیا ئاسوودەیی باڵی بەسەردا دەكێشێت.







سایە

# بێهیوایی لەگەڵ ژیان بوونی نییە!

خاتوو سەمیرە، یەکێکە لەو ئافرەتە پاڵەوانانەی توانی نازناوی دایکی نموونەیی بۆ ساڵی ٢٠١٥ وەربگرێت.. با بزانین خاتوو سەمیرە چۆن ئەم نازناوەی بەدەست هێنا؟

ئەم دایکە نموونەییە دەڵێت: من لە خێزانێکی هەژارو کەمدەرامەتەوە لە گوندێکی دوور لە شار چاوم بە ژیان هەڵهێناوە، هەموو خەونم ئەوەبوو، کە بتوانم بڕۆمە قوتابخانەو بخوێنم، تا فێری خوێندنو نووسین ببم، بەڵام خراپی بارودۆخی دارایی‌و قورسی ژیانمان نەمتوانی بڕۆمە قوتابخانە.

ڕۆژەکان تێ پەڕین، من گەورەبووم، هاوسەرگیریم لەگەڵ پیاوێکدا کرد کە سێ ساڵ لە خۆم گەورەتر بوو، ئەو لە دەریاچەی قاروون ڕاوەماسیی دەکرد، ژیانی هاوسەرگیریمان زۆر درێژەی نەکێشا، تەنها دووساڵو نیو دوای پڕۆسەی هاوسەرگیری، ئەو کاتەی "نەجوا" تەمەنی کەمتر لە دوو ساڵو "عەلا" تەنها تەمەنی پێنج مانگ بوو، هاوسەرەکەی کۆچی دوایی دەکات، ئیدی خاتوو سەمیرە، نازناوی بێوەژنی وەرگرت، سەمیرەخان دەستی بەکارکردن کردو خۆی بە کاری کشتوکاڵکردنەوە سەرقاڵ کرد، زەوییەکی دەچاند کە لە (٥ قراریط) تێ نەدەپەڕی؛ بۆئەوەی داواکارییەکانی منداڵەکانی دەستەبەر بکات، بەیانیان زۆر زوو لە پێش خەڵکییەوە هەڵدەستاو ڕووی دەکردە کێڵگەکەی، دەستی بە کارکردن دەکرد، تا ئەو کاتەی تەواوماندوو دەبوو..

سەمیرەخان تەنها کارکردن بێتاقەتو ماندووی نەدەکرد، لەبەرئەوەی ئافرەتێکی گەنجو لێهاتوو کاسبو بە قەناعەت بوو، یەکێك لەو گرفتانەی ڕووبەڕوی دەبووەوەو زۆر نارەحەتی دەکرد، لە لایەن کەسە نزیکو دراوسێکانییەوە داوای هاوسەرگیرییان لێ دەکرا، ئەویش هەموو داواکارییەکانی ڕەت دەکردەوە، هەر لەبەرئەوەبوو دەوروبەری زۆر دژایەتیان دەکرد..، بەڵام خاتوو سەمیرە سوور بوو لەسەر ئەوەی لەسەر منداڵەکانی دابنیشێتو بە جوانترین شێوە پەروەردەیان بکاتو خەونەکانیان بهێنێتە دی.

کاتێك منداڵەکانی گەورەبوونو چوونە قوتابخانە، ئیدی داواکارییەکانیانی ژیانیان زۆرتربوو، ناچار پەنای برد بۆ بەکرێگرتنی پارچەیەك زەوی یەکێك لە جووتیارەکان؛ تا بتوانێت مەکینەیەکی دروومان بکڕێتو لە ماڵەکەی خۆیدا کاری دروومان بکات.

خاتوو سەمیرە بۆ ماوەی ١٠ ساڵ لەسەر ئەم کارەی بەردەوام بوو، تا ئەو کاتەی منداڵەکانی گەورە بوون، لە ماڵێکدا ژیانیان دەگوزەراند، کە تەنانەت کارەباشی تێدا نەبوو.

نارەحەتیو دەردەسەرییەکانی ئەم خاتوونەو دوو منداڵە چاوگەشەکەی یەکجار زۆربوون، ئەوان لە ژێر سەقفێکی گڵدا ژیانیان دەگوزەراند، بە جۆرێك زۆرجار لە کاتی نووستندا گڵ بەسەریاندا دەهاتە خوار، ئەوان لە نێو ئەو خانووەدا وانەیان دەخوێندو کۆششیان دەکردو ئەرکەکانی قوتابخانەیان جێبەجێ دەکرد.

ژیانیان لێوانلێو بوو لە کولەمەرگی، بەڵام هەرگیز خۆیان تەسلیمی ئەو بارودۆخە نارەحەتە نەکردووە، بەڵکوو بەرگەی نارەحەتییەکانیان گرتووەو ئارامیان لەسەر گرتووە، تا ئەو کاتەی منداڵەکانی بە نمرەیەکی زۆرباشەوە خوێندنی ئامادەییان تەواو کردو عەلا لە کۆلێژی پزیشکی لە زانکۆی فەییوم وەرگیراو نەجواش لە کۆلێژی پزیشکی ددان لە زانکۆی قاهیرە وەرگیرا.

عەلا دەیزانی ئەگەر هەموو تەمەنی کار بکات؛ تا قەرەبووی نارەحەتییەکانی دایکی بکاتەوە؛ ئەوا ناتوانێت قەرەبووی یەك چرکە لە ماندووبوونو نارەحەتییەکانی دایکی بکاتەوە، بەڵام هەموو کات هەوڵی دەدا، خەونی دایکی بەدی بهێنێت، خەونەکەشی بریتی بووە لەوەی کە منداڵەکانی ببنە دکتورێکی بەئەزموونو شارەزا.

هاوکات نەجوا هەمیشە دەستی نزای بەرەو ئاسمان بەرز دەکردەوەو دەیگوت: خودایە لە خوێندن سەرکەوتووم بکە، لەبەر خاتری دایکم، نەك لەبەر خاتری خۆم! خودایە سەرەتا سوپاس بۆ تۆ، پاشان بۆ ئەو دایکە ماندوونەناسەم کە منی گەیاندە ئەم قۆناغەی خوێندن، بەڵێن دەدەم خۆم لە هەموو خۆشییەکانی ژیان بێبەش دەکەم لە پێناوی دایکمو براکەمدا.

ئەو ڕۆژەی پارێزگاری پارێزگای فەییوم نازناوی دایکی نموونەیی بەخشی بە خاتوو سەمیرە، وەکوو ڕێزێك بۆ ئەو هەموو ماندووبوونەی بەرامبەر منداڵەکانی ئەنجامی داوە، هاوکات شوققەیەکی بەخشی بە عەلا لە پارێزگای فەییوم؛ بۆئەوەی بتوانێت خوێندنەکەی تەواو بکات؛ چونکە ئەوان لە گوندێك دەژیان کە ٨٠ کیلۆمەتر لە پارێزگای فەییومەوە دووربوو.

# وشە نهێنییەکەم ژیانی گۆڕیم

بێگەرد فارس

لەم سـەردەمەی ئێستەو ژیانی ڕۆژانەماندا، بۆ چوونە ناو ئامێـری کۆمپیوتەرو مۆبایلەکانمـانو تەنانەت هەندێ لـە پرۆگرامەکانو ئەژمارەکانیشـمان، وشـەی نهێنی بەکار دەهێنین، بەڵام چۆن ئەو وشە نهێنییانە بەکار بهێنین، هەتا ببنە هۆکاری ئەوەی ژیانمان بەرەو هەرەباش بگۆڕێت؟

پاڵەوانی چیرۆکەکەمان کەسێکە ماوەیەکی کەمە بەهۆی جیاوازیو نەگونجانی لەگەڵ هاوسـەرەکەیدا جیا بوونەتەوە، ڕۆژێك کاتێك لەخەو هەسـتاو دەستی بەخواردنەوەی قاوەی بەیانیانی کردو ویسـتی لاپتۆپەکەی بکاتـەوە، وەك هەموو ڕۆژێ کە بەردەوام بەکاری دەهێنا، پاش ئەوەی وشەی نهێنی بۆچوونـە ناو ئامێرەکەی نووسـی، نامەیەکی بۆ هات داوای گۆڕینی وشەی نهێنی لێ دەکرد، ئەو بارودۆخانە زۆر جار ڕوو دەدەنو ناچـار دەبین وشـەیەکی نهێنیی نوێ بەکار بهێنین، بـەڵام پاڵەوانەکەمان ویسـتی وشـەیەکی نهێنی بنووسـێت بەجۆرێك بێت کە گرنگترین شـتی ژیانی بیر بخاتەوە، لەو ساتەدا هاوسـەرەکەی هاتە بیری، سـەرەتای هاوسەرگیریو ساتە خۆشـەکانی کە پێکەوە بەڕێیان کردووە، بۆیە بڕیاری دا وشـە نهێنییەکـە (Forgive her) بێت، بە واتای "لێی خۆش ببە!"

دواتر لاپتۆپەکەی هەڵگرتو بەرەو کارەکەی بەڕێ کەوت، لەو کاتەوە هەرجارێك دەیویسـت لاپتۆپەکەی بکاتەوەو وشە نهێنییەکەی دەنووسـی خۆشترینو باشـترین یادگارییەکانی خۆی هاوسـەرەکەی بەبیر دەهاتەوە، هەر ئەو وشـە نهێنییە وای لـێ کرد، هەموو جیـاوازیو نەگونجـانو ڕاجیاییەکانی لەبیر بکاتو هاوسەرەکەی بگەڕێنێتەوە بۆ لای خۆی!

ئەگـەر ئێمـەش هەمان بیرۆکـە جێبەجـێ بکەینو یەکێك لە گرنگترینی ئامانجەکانمان بکەینە وشـەی نهێنیو هەرجارێـك ئامێرەکان، یـان پرۆگرامەکانـی بکەینەوە ئەو وشـەیە دەنووسـینو دەبێتە پاڵنەرێك بۆزیاتر هەوڵدان بۆ بەدەستهێنانی، بۆیە باش وایە ئەو وشەیەی بەکاری دەهێنین هۆکارێك بێت بۆ گۆڕینی ژیانمان بەرەو باشتر.

س. alrhd





# ئەم پاییزە

سایە سەرگەتی

یەکەمیـــن گەڵای بەهار، گەڵا دەستپێشـــخەرەکە، بیســـتوومە بەجێمان دەهێڵیت، گوایە ترســـاویت لە پاییز، دەنگۆی ســـەختی پاییزت بیســـتووە ئەزیزم، دەزانم، هەمـــوو کۆتایی هاوینێك ئەم دەنگۆیانـــە بڵاو دەبنـــەوە، بەڵام من چاوەڕوانیـــی زیاترم لە تۆ هەیە. بیرمە کۆتا وەرزی پاییز، پێش لەدایکبوونی تۆ بوو، گوێ لـــە من بگرە، با باســـی پاییزت بۆ بکەم؛ چونکە تۆ نایناســـیت، هەرچەنـــد یەکێکە لە چوار منداڵەکەی ســـاڵ، بەڵام ئەو کوڕێکی زۆر تەنیایە، زۆریش دڵسۆزە، دوایی ئەو هەموو گەرمیەی هاوین، فێنکییەکـــی تـــەواو دەدات بەناخمان، لەگـــەڵ هەوایەکی نەرمو ناســـك، دەچێتـــە لای گـــەڵاکان، جارێکیان بینیم، پاییز ویســـتی دەســـت بەســـەرگەڵایەکدا بهێنێتو تـــۆزو ماندوویەتـــی هاوینی لەســـەر لابات، بەڵام گەڵاکە لەترســـا وەری! گەڵای داماو، وەك تۆ هێندە گوێی لەو دەنگۆیانە گرتبوو، کە میهرەبانی دۆستی لێ بوو بەتووڕەیی دوژمن. پاییزی شەرمنیش، بێ ئەوەی لە تێگەیشتنی گەڵاکە تێ بگات، تووشـــی شۆك بوو، هەتا ئێستەش بە غەمگینی لە گۆشـــەیەکی ساڵ دانیشـــتووە، تەنانەت شـــاعیرەکانیش، وەك تاوانبارێك باســـیان کردووە، دەمێکە لە کەمو کورتییەکانی خۆی دەگەڕێـــت، نایانبینێتەوە، ئیتر ســـاڵەهای ســـاڵ وایە، هەتا بێت پاییز لە شەرمدا خۆی دوا دەخات. ئای پاییزی بێکەس، کاتێ پێم وت بۆ بەرگری لە خۆت ناکەیت، وتی: خۆ ناتوانم ببم بە بەهار، سەدان ساڵە ئاهی بوون بە بەهار لەناخمایە، هەموو ساڵێك کە من دەگـــەم، باڵندەکان لەبری بەخێرهاتنەوەم، ئەم ناوە چۆڵ دەکەن. گـــەڵا گیان، بزانە دەنگۆکان پاییزیان کردووە بە چ دێوەزمەیەك، گوێ لەو قســـانە مەگـــرە، کە بە میرات ماونەتەوە، ئەو شـــتەی ئەگەری هەیە لە ســـەرکەوتن نزیکت بکاتـــەوە، بێ گوێدان تاقی بکەرەوە. تۆ باڵندە نیت؛ تا هەرشـــوێنێکت بەدڵ نەبوو، بفڕیت، ئەم دارە نیشتمانی تۆیە، تۆ بەبێ ئەم شوێنە دەمریت، وا بزانم وەك گەڵاکانـــی تریـــش لەگەڵ پۆلێك چۆلەکـــە ڕێك کەوتوویت؛ تـــا یارمەتیت بدەنو زووتر بکەویتە خـــوارەوەو لەناو بچیت، چ هەســـتێکت هەیە، کە بەهۆی هەســـتێکی بێئەزموونەوە، بەرزیی خـــۆت فەرامۆش دەکەیت. دەزانی بۆچی گەڵاکان لە پاییزدا زەرد دەبن؛ چونکە ڕایان وایە خەڵك ڕەنگی زەردی بۆ ئەم کزەبایە پێ جوانـــە، ئیتر هەموو هێزی خۆیان لە زەرد بوون بەکار دەهێنن، ڕاهاتوون بۆ خەڵك بژینو هیچیان تا ئێستە زستانیان نەبینیوە، بـــەڵام من باوەڕم بە تواناکانی تۆ هەیـــە، هەرچۆن پار متمانەم بە گوڵی باخەکەی خۆمان هەبوو، گوڵەکەمان تەنها بوو، لەبارەی پاییزەوە لە کەس هیچی نەبیســـتبوو، بە درێژایی پاییزو زستان بەردەوام بوو لە ژیان، گوڵە سوورەکان بەفریان بینیو تا کۆتایی زســـتان پارێزگارییـــان لـــە جوانییەکەیان کـــرد، بێگومان ترێش دەناســـیت، دەزانیت بەتامترینی ئەو ترێیەیە کە تا ناوەڕاســـتی پاییـــز دەمێنێتەوە. دەمەوێت پێت بڵـــم تۆ تەنیا نیت، بەردەوام بە، بە یەکەم بارانی پاییز، کۆتا فرمێسکی ترسو دوو دڵیت بشۆ، ڕێ بکە بۆ ناو ناخی پاییز، دڵی مەشکێنە، مەڵێ ئەستەمە، دڵنیا بە، کە یەکەم پاییزو یەکەم شکســـتت تێپەڕاند، ئیتر ناتوانی بێ ئارەزووکـــردن بـــۆ پاییز بژیت؛ چونکە ئـــەو بەهێزترین ڕێگەی تۆیە بۆ گەیشتن بە بەهار.

# ئایا دەتوانیت ساڵانە ٥٠ کتێب بخوێنیەوە؟

و: محەممەد مێرگەیی

**بەڵێ.. دەتوانی!**

تاقی بکەرەوە، کە ڕکەبەری خۆت بکەیتو ئارمانجێك دابنێیت هانت بدات بۆ خوێندنەوەی کتێبێك لە هەر هەفتەیەکدا. وا مەزانە ئەگەر ئەوە بکەیت موعجیزەیە، یەکێك لە ڕێبەرانی کارو بزنسی ئەمریکی، کە زۆر زیاتر لە منو تۆ سەرقاڵترن، دوو بە قەدەری ئەم ئامانجەی دایە بەرخۆیو توانی ١٠٠ کتێب لە ساڵێکدا بخوێنێتەوە! گومانم نییە تۆش دەگەیتە ئارمانجی خۆتو نیشانەکەت دەپێکیت، ئەمە ئەگەر قەناعەتەکانو نەریتەکانی ڕۆژانەت بگۆڕیتو هەندێك ڕەفتارگەلی (پۆزەتیڤ) ئەرێنی سادە جێبەجێ بکەیت.

ئێستا دەخوازم پرسیارێکی دیکەی ڕاستەوخۆت ئاڕاستە بکەم، دڵنیام لەوەی تۆ بە ڕاشکاویی وەڵام دەدەیتەوە: ئایە ڕۆژانە تۆ چەند کاتو وەختت لەسەر ماڵپەڕەکانی (سۆشیال میدیا) بەسەردەبەیت: ٣٠ خولەك؟ کاتژمێرێك؟ دووان؟ یان سێ کاتژمێر؟ هەر کەسێك ڕۆژانە سەعاتێك لە تەمەنی خۆی لەسەر (فەیسبوك) بەفیڕۆ بدات، لەڕاستیدا وەك فەرمانبەرێکە بەبێ هیچ بەرامبەرێك کار دەکات-لە کن کۆمپانیای (کتێبی ڕوخسارەکان)، ئەو کەسە تەنها بەهای پشکی ئەم کۆمپانیایە بەرز دەکاتەوەو خزمەتی خاوەنەکەی (مارك زوکربیرگ) دەکا بەبێ بەرامبەر! ئایە تۆش ئەوە دەکەیت؟ ئەگەر وەهایە، کەواتە ئیدی (کتێبی ڕوخسارەکان) دابخەو (ڕوخساری کتێبەکان) بکەوە، ئەو سەعاتەی (فەیسبوك) تەرخان بکە بۆ خوێندنەوە، بەمەش ئەو ژمارە پێشنیارکراوە (خوێندنەوەی کتێبێك لە هەر هەفتەیەکدا) بەدەست دەهێنیتو بە ئامانجەکەت دەگەیت.

لە کۆمەڵگە خۆرئاواییو خۆرهەڵاتییەکان –بەداخەوە هی ئێمە نا- خوێندنەوەی (٥٠) کتێب لە ساڵێکدا بە دەستکەوتێکی مەزن نازانن، ئەوان لەپێناوی زانست، کار، هەروەها چێژوەرگرتن دەخوێننەوە. خوێندنەوەی کتێبێك هەفتانە، واتە ئێمە -بەتێکڕایی- بەدرێژایی ژیانمان دەکرێ ٣٠٠٠ هەتا ٤٠٠٠ کتێب بخوێنینەوە، ئەمەش بەبۆچوونی من ژمارەیەکی زۆر نییە، لە جیهانی ئەمڕۆ لە هەر سەعاتێکدا ٢٥٠ کتێب واتە: (ناونیشان) چاپ دەکرێت. کۆمپانیای (ئەمازۆن) هەر تەنها بە کڕینی ئامێری خوێنەری ئەلیکترۆنی (کیندل) نزیکەی ٨٠٠،٠٠٠ ناونیشان دەخاتە بەردەستت، ئەمە بێجگە لە یەك ملیۆن کتێب (ئەمازۆنی) کە هێشتا بەشێوەی ئەلیکترۆنی دابین نەکراوە!

ئێستا لە سایەی ئەم ژمارە جووڵێنەرانە، وا بزانم دەتوانیت دوور بکەویتەوە لە پاکەتی جگەرە، یا نێرگەلەو دوو سەعات بەفیڕۆدانی بەردەم تەلەفزیۆنو دانیشتنی قسەی بێئامانجی چایخانە؛ تا ئەم بیرۆکانە تاقیی بکەیتەوە:

-کتێب بەشێوەی گرووپ بکڕە، نەوەك بەشێوەی تاك تاك، ئینجا لە هەموو گۆشەیەکی ماڵەوە بڵاویان بکەوەو دایان بنێ: ژووری خوانو هۆڵی دانیشتن، ژووری خەوتن،



تەنانەت لە گەرماویش! پەرتووکخانەکەت بەسەر ڕەفو دەلاقە جۆراوجۆرەکانی ماڵەوەت دابەش بکەو ڕووبەرە ڤالاو بەتاڵەکانی سەر دیوارەکان بقۆزەوە، لەباتی کۆمکردنیان بە تەنها لە یەك شوێندا. ئەقڵی مرۆڤ هەردەم بەلای ئەو شتەدا دەچێت کە لێی دیارەو بە بەر دەستو چاوی دەکەوێت، زێدەتر لەوەی لە ئەندێشەو خەیاڵی دایەو ئاواتی بۆ دەخوازێ.

-یانەیەکی خوێندنەوە دابمەزرێنەو دەگەڵ هەڤاڵو هاوپیشەکانت کتێب بگۆڕەرەوە، تەنانەت لەگەڵ کارمەندەکانیشت. هەفتانە ڕۆژێك کۆ ببنەوە؛ بۆئەوەی هەریەکەو چی خوێندووەتەوە بیخاتە ڕوو و بەرباس. کتێبەکانت بە ئیستیعارە بدە بە ئەندامانی یانەکە، هەروەها بە هەمان شێوە تۆش لێیان ئیستیعارە بکەو لەسەر بنەمای ڕەوشتییو ڕۆشنبیرییەوە، پابەند بن بە گەڕاندنەوەی کتێبەکان بۆ سەرچاوەکانیان لە هەر هەفتەیەکدا، بە مەرجێك هەر یەکێك کتێبەکەی خۆی خوێندبێتەوە.

-کاتێك خشتەی کارەکانت ڕێك دەخەیتو لیستی ئەنجامدانی کارە گرینگەکانی هەفتانەت دادەنێیت، دانانی کاتی تەواو بۆ کتێب خوێندنەوە لەبیر مەکە، وەك ئەوەی ئەم کارە (خوێندنەوە) یەکێك بێت لە سەرووی کارە گرینگەکان؛ بۆئەوەی پلانسازییو کارگێڕیی کات مانای خۆی لەدەست نەدا، بۆ هەر ٢٤ سەعاتێك، یەك سەعات، یان دووان، بە تایبەت دابنێ بۆ کتێبو خوێندنەوەی کتێبان.

-لە کاتەکانی چاوەڕوانیدا، لە گەشتو گەڕان، لە مابەینی جڤینو کۆبوونەوەکان، لە بەیانیانو شەوان بەر لە ڕازان، کتێب بخوێنەوە. لەناو ئۆتۆمبێلدا، با شۆفێرەکەت کاری هاژووتنت بۆ بکاتو کاتەکانی هاتوچۆو قەرەباڵغی ڕێگاکان بقۆزەرەوەو تۆ بۆ خۆت سەرقاڵی خوێندنەوە بە، بەمەش هەمدیس لە گرژیو فشاری قەرەباڵغی شارو ڕێگە خێراکان دوور دەبیت. ئەگەریش تۆ لەوە نەبیت شۆفێری تایبەت هەبێت؛ ئەوا کتێبی دەنگی، یا بیستراو (ئۆدیۆ) بەکار بهێنە کە ئێستا بەخێرایی ئەم جۆرە کتێبەش لە گەشەدایە، لە هەمبەر کتێبی چاپکراوی خودان تێچووی زۆر.

-دوور بکەرەوە لەو جۆرە خوێندنەوەیەی پێی دەگوترێ (خوێندنەوەی خێرا)، ئەمە داهێنانێکی ئەمریکییە، من وا دەزانم ئەوە شێتییە نەوەك خێرایی. گشت وشەو پەیڤێك بخوێنەرەوە، بەدوای ماناو دەلالەتو چێژی زەینیدا بگەڕێ، تەنانەت بەسەر یەك وشەشدا بازمەدەو یەك ڕستەش بەجێ مەهێڵە. خوێندنەوە پڕۆسەیەکی مرۆیینی سرووشتییە هەروەکوو: خواردنو خەوتنو خەنینو خۆشەویستی. ئایە تا ئێستا کەسێکت دیوە بەدەم غاردانەوە، پڕاکتیکی خۆشەویستی بکات!؟

ئەگەر مەشقو ڕاهێنانە وەرزشییەکان بەسوود بن بۆ لەش؛ ئەوا خوێندنەوە وەرزشێکی زەینیو فیکریی بەکەڵکە بۆ مێشك. کتێبەکان ترپەو ئەفسوونی جووڵاوەن، پەنجەرەی خەیاڵن بۆ ئەو جیهانە دوورهانەی ناتوانین پێیان بگەین، دەتوانین بیاندۆزینەوەو بیانهێنین لەبەرچاوو لە چواردەوری دڵەکانمان، لە ڕۆحەکانماندا جارێکی دیکە بنیاتیان بنێینەوە، ئەوە ژیانەوەیەکی نوێیە بۆ ئەوەی هەبووەو بۆ ئەوەی کە دەبێت.

# بۆ گەرماو چوونی
# باڵووڵ

درەخشان بەهادین

جارێکیان باڵووڵ دەڕوات بۆ گەرماو، بەڵام خزمەتگوزارەکانی گەرماوەکە وەك کەسەکانی تر، گرنگییەکی ئەوتۆی پێ نادەنو خزمەتگوزاریی تەواوی پێشکەش ناکەن. کاتێك باڵووڵ لە خۆشۆردن تەواو دەبێت دە دینار دەدات بە سەرپەرشتیاری گەرماوەکە، خزمەتگوزارەکان کاتێك ئەم سەخاوەتو بەخششەی باڵووڵ دەبینن، پەشیمان دەبنەوە لەوەی کە بۆچی خزمەتیان نەکردووەو گرنگی تەواویان پێ نەداوە

باڵووڵ دیسان دوای هەفتەیەك دەچێتەوە بۆ هەمان گەرماو، بەڵام ئەمجارە هەموو خزمەتگوزارەکان، زۆر بە ڕێزەوە خزمەتی دەکەنو ئاگاداری دەبن، کەچی باڵووڵ دوای ئەو هەمووو ڕێزو خزمەتە، پێش دەرچوونی لە گەرماوەکە تەنها یەك دیناریان پێ دەدات، خزمەتگوزارەکان سەریان سوڕ دەمینێتو دەپرسن هۆی ئەو بەخششو سەخاوەتەی هەفتەی ڕابردووو ئەم ڕەفتارەی ئەمڕۆت چییە؟

باڵووڵ دەڵێت: "هەفتەی پێشتر پارەی ئەمڕۆم پێ داون، ئەمڕۆش پارەی هەفتەی ڕابردووتان پێ دەدەم، تا ئێوە فێر بن کە لەگەڵ موشترییەکانی خۆتاندا ئەدەبتان هەبێتو وەك یەك گرنگی بە هەموو لا بدەنو خزمەت بکەن.






# ڕاسپاردەی باوکێك بۆ ڕۆڵەکەی لە سەردەمی ئەنتەرنێتدا!

زەینەب سەعید

ڕۆڵەگیان، گوگڵ، فەیسبووك، تویتەر، واتسئەپو هەموو بەرنامەکانی پەیوەندی، دەریایەکی قووڵن‌و ڕەوشتی مرۆڤەکانی تێدا زایە بووە!!عەقڵەکانی تێ کەوتووە!! لەوانە هەندێکیان گەنجن، هەندیکیشیان پیرن.. شەپۆلەکانی شەرمی پاکیزەکانیان قوتداوە، تێیدا زۆرێك لە ڕەوشتە جوانەکان فڕیان تێ کەوت.

جا ئاگادار بە تێیدا ڕۆنەچی، وەك هەنگ بە تێدادا، تەنیا لەسەر بەرنامەو پەیجە باشەکانی بوەستە؛ تا سەرەتا سوود بە خۆت، پاشان بەکەسانی دیکە بگەیەنیت.

جگەرگۆشەکەم، وەك میشولە مەبە، کە بەسەر هەموو شتیکی پیس‌و پاکەوە دەنیشێتەوەو بێ ئەوەی هەستی پێ بکات، تەشەنە بە نەخوشی دەکات.

ئەزیزەکەم، ئەنتەرنێت بازاڕێکی گەورەیە، هیچ کەس بەخۆڕایی شمەکی ناخاتە ڕوو، هەموان لە بەرامبەردا شتێکیان دەویت، هەیانە بەرامبەر کەلوپەلەکەی، خراپکردنی ڕەوشت‌و ئاکاری دەوێت، تێیشیدایە دەیەوێت بۆچوونە گوماناوییەکەی بخاتە ڕو، هەیانە دەیەوێت ناوبانگێك بەدەست بهێنێ!!و هەشیانە چاکەکارن. سا لەبەرئەوە هیچ شتێك نەکڕیت، تا بەجوانی گشت شمەکەکان نەپشکنیت.

جەرگەکەم، نەکەی بەستەرەکان "لینکەکان" بکەیتەوە؛ چونکە هەندێکیان تەڵەو داون، زیانێکی گەورەن، هاك‌و هاکەرانن، وێرانی‌و وێرانکارین.

کوولەکەی ڕۆحم، نەکەیت دەنگۆو قسەی نەشیاو بڵاو بکە بکەیتەوە.. خۆیشت لە کۆپی پەیستی حەرامکراوەکان بپارێزە، چاك بزانە، ئەم کارەت بازرگانیی چاکەو خراپەت بۆ دەکات! کەواتە: کەلوپەلەکانت پێش خستنە ڕوویان هەڵبژێرە؛ لەبەرئەوەی کڕیار ڕاوێژ ناکات.

هێزی هەناوم، پێش ئەوەی سەرنج‌و کومێنتێك بنووسیت، یان لایکێك بکەیت؛ بیر بکەرەوە، بزانە خودا پێی خوش دەبێت، یان پێی تووڕە دەبێت.

قەڵەمی ئەژنۆم، پشت بە هاوڕێیەتیی کەسێك مەبەستە، کە بە چاوەکانت نەتدیبێت، بڕیار لەسەر پیاوان مەدە لەڕێگەی نووسینەکانیانەوە؛ چونکە ئەوان نائاشنان بۆ تۆ، وێنەکانیان دۆبلاجکراوە، ڕەوشتیان ئارایشتکراوە، وشەکانیان بریقەدارە،و ماسك‌و ڕووبەند دەپۆشن‌و لێزانانە درۆ دەکەن.

ئای چەندان پیاوی باشی ناو ئەو دونیاییە، گەورەترین نەفامن، چەندان جوانی تێدا هەن، کە ناشیرینترین ناشرینن، چەندان سەخی هەن، سەرۆکی پیسکەکانن،و چەندان چاونەترسی تێدا هەن، ترسنوکترین کەسن، بێجگە لەوانەی خودا وەبەر میهرو ڕەحمەتی خۆی خستتوون. کەواتە: لەوانە بە، کە بەر ڕەحمەتی خودا کەوتوون.

ڕووناکیی چاوم، وریای ناوە خوازراوەکان بە؛ چونکە خاوەنەکانیان متمانەیان بە خۆیان نییە، سا متمانە بە کەسیك مەکە، کە متمانەی بە خۆی نییە. نەکەی ناوی خوازراو بەکار بهێنێت؛ چونکە خودای پاك‌و بێگەرد، لە چی نهێنی‌و پەنهانە باش ئاگادارە.

سوکنایی دڵم: هەرکەس برینداری کردیت؛ تو برینداری مەکە؛ چونکە تو نوێنەرایەتیی خوت دەکەیت‌و ئەویش نوێنەرایەتیی خوی دەکات، تو ڕەوشتی خۆت پیشان دەدەیت، نەك ڕەوشتی ئەو، دردی پێشینان دەڵێن: جام چی تێدا بوو، ئەوەی لێ دەڕژێت.

گلارەی دیدەم، ئەوەی دەینووسی پاڵفتە بکە؛ چونکە ئەوەی بڵاوی دەکەیتەوە، فریشتەکانیش دەینووسن‌و خودای گەورەش لە سەروو هەموانەوە، دەپرسێتەوەو چاودێری دەکات.

ئۆقرەیی بیناییم، ترسناکترین شت کە لێی دەترسم، لە دەریای ئەنتەرنیتدا تووشت بێت، تەماشاکردنی حەرامو گرتەی نەشیاووناشرینە، ئەو حەرامکراونە تێ بپەڕێنەو سوود لەم نێتە وەربگرە بۆ خزمەتی خۆتو پەیوەندیت لەگەڵ کومەلگاکەتدا، هەوڵی بڵاوکردنەوەی دینەکەت‌و شتە باشەکان بدە، گەر خۆت لەناو قوڕاوی تاوان‌و حەرامدا دییەوە؛ ئەوا لە جیهانی ئەنتەرنیتدا هەڵبێ، وەك چۆن لەدەست دڕندەیەکی بەهەڵپەو کەڵبەتیژ هەڵدێیت؛ چونکە هەر زوو هەوارت دەبێت بە دۆزەخو سبەی خودای لە هەمبەر خودای خاوەنشکۆدا ڕادەوەستێنرێیت.

گۆچانی دەستم، گرنگترین دەروازەکانی شەیتان، بیئاگایی‌و ئارەزووبازییە، ئەو دووانەش کۆڵەکەی ئەنتەرنێتن.. چاك بزانە، ئەم شتە، بۆ بێئاگایی تۆ درووست نەکراوە، بەڵکوو بۆ خزمەتی تۆ درووست کراوە. دەسا بەکاری بهێنەو وای لێ مەکە بەکارت بهێنێت، بیکە بە مایەی بونیادنانت، نەك ڕووخاندنت، بیکە بە بەڵگەیەکە بۆ خزمەتت، نە ك بە بەڵگەیەك لە دژت.

# له ڕوانینت بڕوانه!

ئەسکەندەر ڕەحیم

له دێرین زه‌ماندا، مامۆستایه‌ك كه له ئاوه‌دانییه‌كدا كاری ده‌كرد، تابلۆیه‌كی گه‌وره‌و سپی به دیواری پۆلدا هه‌ڵواسی‌و داوای له قوتابییه‌كانی كرد، كه كورتترین ڕسته له‌سه‌ر تابلۆكه بنووسێت، كه ژیانی مرۆڤ بتوانێت به‌و ڕسته‌یه، هه‌میشه له ڕێی دروستدا تۆقره بگرێت‌و بهێڵێته‌وه.

قوتابییه‌كان چه‌ند هه‌فته‌یه‌ك بیریان كرده‌وه، هه‌ریه‌كیان وته‌یه‌كی جوانیان گوت، به‌ڵام مامۆستا هیچیانی پێ په‌سه‌ند نه‌بوو!

ڕۆژێكیان پیاوێكی جلشڕو شڕوشه‌وێڵ، به ڕوخساری زامدارو جه‌سته‌ی ماندووه‌وه هاته نێو ئاوه‌دانییه‌كه‌و له‌به‌ر سه‌روسیماو شپرزی‌و شه‌پرێوییه‌كه‌ی، هیچ كه‌سێك له‌و ئاوه‌دانییه‌دا ئاوڕی میهره‌بانی لێ نه‌دایه‌وه؛ نه نان‌و ئاوی پێ دا، نه جێ‌و ڕێی بۆ كرده‌وه.

كابرای زامدار به پرساوپرس خۆی گه‌یانده لای قوتابخانه‌ی مامۆستاكه، سه‌روسۆراغی مامۆستاكه‌یانی لێ پرسین، ئه‌وانیش بردیانه لای مامۆستا.

یه‌كێك له قوتابییه‌كان گوتی: وا گومان ده‌به‌م، ئه‌م پیاوه هه‌ڵاتووه، هه‌ر ده‌بێت هه‌ڵه‌یه‌كی گه‌وره‌ی كردووه‌و هه‌ر له‌به‌ر ئه‌م هۆیه هه‌ڵاتووه‌و ئێستەش هاتووه‌ته لای مه، ڕه‌نگه سه‌ربازانی حكوومه‌ت به دوایدا به‌رێن‌و ئه‌گه‌ر لێره‌دا بیدۆزنه‌وه، دڵنیا بن بارێكی ناڵه‌بارمان بۆ ده‌هێننه پێش.

قوتابییه‌كی دیكه گوتی: دیاره ئه‌مه یه‌كێكه له جه‌ته‌و ڕێگره‌كان، به فرتوفێڵ هاتووه‌ته ناو ئاوایی، تا شتێكی بۆ دزێتی په‌یدا بكات.

قوتابیی دواتر گوتی: وای بۆ ده‌چم، ئه‌م پیاوه، نه‌خۆشییه‌كی وه‌ها مه‌ترسیداری هه‌بێت، كه هیچ كه‌س زاتی ئه‌وه‌ی نه‌كردووه یارمه‌تی بداتو تیماری بكات، ڕه‌نگه ده‌رنگ، یان زوو، نه‌خۆشینه‌كه‌ی به‌ناو سه‌رجه‌م قوتابیاندا بڵاو ببێته‌وه‌و ئێمه‌ش نه‌خۆش بكه‌وین.

وه‌لێ مامۆستا كه پیاوه بێچاره‌و بێكه‌سه‌كه‌ی له‌و دۆخه‌دا بینی، گوێی به قسه‌ی قوتابییه‌كانی نه‌داو ده‌سبه‌جێ داوای لێ كردن، نان‌و ئاوو ژوورێكی پێ بده‌ن‌و پۆشاكێكی شیاوی له‌به‌ر بكه‌ن، ئه‌مجا لێی بگه‌ڕێن؛ تا به‌باشی بحه‌وێته‌وه. ئه‌و پیاوه چه‌ند هه‌فته‌یه‌ك، به‌ئاسووده‌یی له ژوورێكی قوتابخانه‌كه‌دا نیشته‌جێ بوو.. ڕۆژێكیان پاش ئه‌وه‌ی به‌ته‌واوه‌تی پشووی دابوو، كه‌وتبووه‌وه سه‌ر حاڵی باشی خۆی، هاته ناو پۆلی مامۆستاو له گۆشه‌یه‌كدا دانیشت‌و گوێی بۆ قسه‌كانی ڕادێرا.

مامۆستا له كۆتایی وانه‌كه‌دا، داوای له پیاوه‌كه كرد، گه‌ر دڵی پێیوه‌یه‌تی، خۆی بناسێنێت.

پیاوه‌كه گوتی: من بازرگانێكی هێجگار ده‌وڵه‌مه‌ندی شارێكی زۆر دووره‌و بۆ دیده‌نیی دۆستێكم هه‌فته‌یه‌ك به‌ڕێوه بووم‌و خۆم‌و ئه‌سپه‌كه‌م كه‌وتینه ناو چه‌می نزیك ئاوه‌دانییه‌كه‌تانه‌وه، به هه‌زار نارەحه‌تی‌و زه‌حمه‌ت له چۆمه‌كه قوتارم بوو، هه‌رچۆنێك بێت به‌زامداری‌و شه‌كه‌تی خۆم گه‌یانده نزیك قوتابخانه‌كه‌تان.

هه‌روه‌ها گوتی: خاووخێزانی له بارودۆخی ئاگادار كردووه‌ته‌وه، به‌زوویی ئه‌سپسواران‌و خزمه‌تگوزارانی ده‌گه‌نه ئێره، تا بیگه‌ڕێننه‌وه بۆ ماڵه‌وه.

دواتر گوتی: ئێسته‌ش له‌به‌رامبه‌ر لوتف‌و میهره‌بانی‌و میواندۆستیی ته‌واوی قوتابخانه‌كه‌تان، سوپاسگوزارییه‌كی بێئه‌ندازه‌م هه‌یه بۆتان‌و له‌به‌رئه‌وه‌ی به‌ده‌م ئێش‌و ئازاری منه‌وه بوون‌و منتان له‌و ناخۆشییه ڕزگار كرد؛ تا باری لاری قوتابخانه‌و ئاوه‌دانییه‌كه‌تان ڕێك ببێته‌وه‌و باشتر ببێت.

له‌م ساته‌دا قوتابییه‌كان تێكڕا هاواری خۆشی‌و شادییان گه‌یشته ته‌شقی ئاسمان‌و زۆر خۆشحاڵ بوون به‌وه‌ی پیاوێكی دڵتێری سرووشته‌خی، له كاری مرۆڤدۆستانه‌دا ده‌ستگیرۆیی قوتابخانه‌كه‌یان ده‌كات.

كاتێك وانه‌كه ته‌واو بوو، ئاماژه‌ی بۆ تابلۆ سپیه هه‌ڵواسراوه‌كه كردو گوتی: به بڕوای من، نووسینی ڕسته‌یه‌ك له‌سه‌ر ڕووی ئه‌م تابلۆیه، تابلۆكه جوانترو مانادارتر ده‌كات، به‌چه‌شنێك هه‌ر كه‌سێك به بیركردنه‌وه له‌باره‌ی ئه‌م ڕسته‌وه، مرۆڤ له‌سه‌ر ڕاسته‌ڕێ ده‌هێڵێته‌وه.

قوتابییه‌كان به‌سه‌رسامییه‌وه گوێیان بۆ گوته‌كانی پیاوه‌كه ڕاگرتبوو، ئیدی دوایان لێ كرد، گه‌ر گوته‌یه‌كی پێ شك دێت، بیڵێت.

ئه‌ویش گوتی: "جارجاره له ڕوانینت بڕوانه" چونكه ئێمه‌ی مرۆڤ، به‌گشتی له ڕووداوه‌كانی ده‌وروبه‌ری خۆمان ده‌ڕوانین‌و له جوارچێوه‌ی زه‌ینیی خۆمان، تێڕوانینه‌كانمان ده‌خه‌ینه سه‌ر شته‌كان، كه ڕێی تێ ده‌چێت ڕاستو درووست نه‌بێت.

وه‌لێ ئه‌گه‌ر مرۆڤ فێر ببێت، كه جاروبار تیله‌چاوێك بگرێته ڕوانینی خۆی‌و به‌بێ سام‌و سڵ چاو له هه‌موو شتێك نه‌بڕێت؛ ئه‌وا به كۆنترۆڵكردنی ڕێڕه‌و ڕوانین، ده‌توانێت له زۆرێك بڕیاری سه‌رپێییانه‌و نادرووست سه‌باره‌ت به كه‌سه‌كان، خۆی به‌دوور بگرێت‌و ببێت به خاوه‌نی ڕوانینێكی پاك‌و په‌سه‌ند.

مامۆستاش یه‌كسه‌ر گوته‌كه‌ی له‌به‌دڵ نیشت‌و فه‌رمانی پێ دان له‌سه‌ر تابلۆكه بنووسن:

"جارجاره له ڕوانینت بڕوانه"



نامەی پەنجاونۆ

# نامە نوورییەکان

ئەوانەی لە نیوەشـــەودا لەنێو جێگاکانیاندا، ئەم دیوو ئەودیــو دەکەنو دوور لەیادو زیکرو موناجاتی مەحبووبی خۆیــان ، ئۆقــرە ناگرنو ناتوانن بســرەون، پەتووەکانیان جێ دەهێڵنو جێگای خەوتن فەرامۆش دەکەنو بەئەسپایی دەســتنوێژ هەڵدەگــرنو دەچنە ســەر بەرماڵــی ئەوینو بەندایەتیو نوێژی دڵ دادەبستن!

کۆتا شەوەکانی پاییز ســاردن، خەوی دوای نیوەشەوو دەمەوبەیان خۆشە.

وەلــێ هەرگیــز لەگــەڵ خۆشــیو لەزەتــی موناجاتی سەحەردا بەراورد ناکرێ!

دەبێ چی هەبێ لە دیداری خۆشەویست خۆشتر!

ئەو کاتەی بانگت حەرفی تێدایە

"مونادا" تەنها زاتی "الله"یە

ڕازونیازت هەر بۆ لای ئەوە

چلچرای عومرە، ئەوە کەی شەوە!!

هەر بۆیــە خوداوەند دەفەرموێت: ﴿ تَتَجَافَىٰ جُنُوبُهُمْ عَنِ ٱلْمَضَاجِعِ يَدْعُونَ رَبَّهُمْ خَوْفًا وَطَمَعًا وَمِمَّا رَزَقْنَٰهُمْ يُنفِقُونَ ﴾

السجدة: ١٦

واتە: جێگاکانیان جێ دەهێڵنو لێیان دوور دەکەونەوە، دێنە نێو دۆعاو نزاو پاڕانەوەو موناجاتی ئیلاهی لە ترسی خوداو سزای ئیلاهی و هاوکات بە ئومێدی بەهەشتی بەرینو پاداشتی خودایی، وێڕای بێداری شەوێو ئامادەبوون لە ژوانی بەندایەتیدا، لە پێناوی خوداو گەیشتن بە پاداشتو ڕازیبوونی زاتی «الله»دا لەو ماڵو سامانە دەبەخشن کە خودا پێی بەخشیون!

چونکە ئەوەی لە مانای گەورەیی خوداو مەقامی بەندایەتیو بەرزیی پاداشتی ئاخیرەت گەشت بێ، زۆر بەسانایی ماڵو سەروەت لە پێناوی خودا دەبەخشێت!

خودای گەورەش لە وەڵامو پاداشتی کاری ئەو بەندە ساڵحانەدا دەفەرموێت:

﴿ فَلَا تَعْلَمُ نَفْسٌ مَّآ أُخْفِيَ لَهُم مِّن قُرَّةِ أَعْيُنٍ جَزَآءَۢ بِمَا كَانُواْ يَعْمَلُونَ ﴾ السجدة: ١٧

خودای گەورە بەشێوەیەك ڕێز لە شەونخوونیو فرمێشکی شەوو ناڵەی سەحەری بەندە ئەویندارە ڕاستەقینەکانی دەگرێت، کە پاداشتانێکی وەها گەورەی بۆ داناون، کە هیچ کەسێك نایزانێو پەی پێ نابات!

ئەو بەندانەی بەپەنهانی لەژێر باڵی ڕەشی شەودا، جێگای نووستنیان جێ هێشت؛ خودای گەورەش بەپەنهانیو نهێنی، پاداشتی هێندە گەورەی بۆ دانان، کە لە هەموو خەڵکی شاردۆتەوەو جگە لە خۆیان، کە لە ڕۆژی دواییدا بە دیداری دڵشاد دەبنو شادمانییەکی بێسنوور ڕوویان تێ دەکات، کەسی دی نازانێ خودا چی بۆ ئامادە کردوون!

خوداوەند هێندە کارەکەی ئەوانی بە لاوە گرنگو مەزنە، دەفەرموێت: ﴿ جَزَآءَۢ بِمَا كَانُواْ يَعْمَلُونَ ﴾ السجدة: ١٧

هەر لەبەر ئەمە ئازیزم، شەونوێژ سیمای ساڵحینو ئاکاری هەمیشەییو سلووکی بەردەوامی سالیکینی ڕێگای ئەوینو خۆشەویستیو بەندایەتیی خوداوەند بووە!

شەونوێژو بەخشینیش دوو کارن، کە تەنها بە ڕاستگۆو موخلیسەکان دەکرێت.

حەسەنی بەسری دەفەرموێت: «هیچ کارێك نییە زەحمەتتر بێت لە شەونوێژو بەخشینی ماڵ:

لێشیان پرسی: بۆچی بێدارانی شەو، ڕوخساریان هێندە جوانە؟

چونکە ئەوان، چوونەتە نێو خەڵوەتی ئیلاهیو خوداوەندیش لە نووری خۆی پێ بەخشین!

ئیبنولقەییم: «هەموو بەندەیەك، دوو وەستانی هەیە بەرامبەر بە خودا؛ وەستانی یەکەم لە نوێژدا، وەستانی دووەم لە بەردەستیدا ڕۆژی دوایی».

ئەوەی مافی وەستانی یەکەمی دابێت لە دونیادا، خودا وەستانی دووەمی بۆ ئاسان دەکات، وەلێ ئەوەی وەستانی یەکەمی بە لاوە گرنگ نەبووبێو ڕێزی نەگرتبێ، خودا وەستانی دووەمی زۆر بۆ قورس دەکات».

لە ترسی ئەو ڕۆژە بوو، پیاوچاکان وەکوو ئێستای ئێمە نەبوون کە بەڕۆژ چوستو چالاك بێنو بچنو بەشەویش تا بەیانی وەکوو لاشەیەکی مردوو لێی بکەون.

مەسرووق دەیگوت: «لەم دونیایەدا، چی ماوە ئارەزووی بکەین، جگە لەوەی کە ڕوخسارمان لە خۆڵ وەردەدەین لە پێناوی خودادا، خەم بۆ هیچ شتێکی ئەم دونیایە ناخۆم، جگە لە شوژدەبردن بۆ خودا».

ئەبوئیسحاقی سەبیعی دەگریا، لێیان پرسی بۆچی دەگریێت؟ گوتی: پیر بووەو هێزم لێ براوە، ناتوانم بەپێوە بوەستم لە شەونوێژدا، تەنها بە خوێندنی بەقەرەو ئالی عیمران نەبێ!

تەماشا کە ئازیزم، ئەم خواناسە دەگری لە شەرمەزاریدا؛ چونکە شەوانە ناتوانێ زۆر بەپێوە بوەستێ، دوای ئەوەی هەردوو سوورەتی بەقەرەو ئالی عیمران بەپێوە دەخوێنێ، کە نزیکی پێنج جزمن لە قورئان، ناچار دەبێت بەدانیشتنەوە نوێژ بکات!!

ئەوان بە هیممەتی بەرزو ئەوینی ڕاستەقینەو دڵی ئاوەدان بە ئیمانو یەقینەوە، هەموو کارێکیان لا ئاسان بوو، ئەوان تامی حەلاوەتی ئیمانو لەزەتی خوشوعو چێژی موناجاتیان کربوو!

هەر کەسێکیش ئەو چێژو لەزەتەی تاقی کردبێتەوە؛ ئیدی گاڵتەی بە هەموو خۆشیو لەزەتی دونیا دێتو دەزانێت کە هەموو ژیانی دونیا، جگە لە خۆشییەکی خەڵەتێنەر چیدی نییە!

﴿ وَمَا ٱلۡحَيَوٰةُ ٱلدُّنۡيَآ إِلَّا مَتَٰعُ ٱلۡغُرُورِ ﴾ آل عمران: ١٨٥

ع.ش.شێرکۆ

# لەگەڵ کتێبدا ٢






نەدار
-نیوز عەلی نەدار.
- ئامادە.

یەکەم جار کە دیتم، لە نزیک ئاوەچۆڕی قوتابخانە دانیشتبوو، کۆخەی هاتێ، لەگەڵ کۆخین ڕادەچەنی، خوێنێکی ئاڵی هێنایەوە، دەمی بە قۆڵی کەوایەکەی پاك کردەوە، بەپەلە چۆوە پۆلەکەیو لە ڕیزی پێشەوە دانیشت.

پۆلی دووهەم بوو، چووك ڕیوەڵە بوو بە ڕەنگێکی زەردەوە، ڕەگی ملی لە بن پێشتەوە دیار بوو، کە وەك نۆبەتێداران لیی دەدا.

قەڵەمەدارەکەی بە دەزوویەك لە کونەدوگمەی کەوایەکی خستبوو، کاتێك شتی دەنووسی؛ چونکە دەزووەکە کورت بوو، زگی دێنایە پێشەوە، دەتگوت لە جیاتی قەڵەم، لەشی خۆی بەسەر کاغەزدا دێنێ. کاتێك دەستنووسەکەیم لێ وەردەگرت، دەستەکانی دەلەرزین، کاغەزی نووسینی لەنێو زبڵدانی قوتابخانەدا دەدۆزییەوە، وەختێك خەتم بەسەر دەستنووسەکەیدا دێنا، هەستم دەکرد خەت بەسەر ژیانیدا دێنم. نیوەڕۆیان نەدەچۆوە ماڵێ، لەجێدا زۆربەی منداڵەکان نەدەچوونەوە ماڵێ، نانە ڕەقو کۆنەکەیان هەر لەوێ لەبن دیوارە قوڕینەکەی قوتابخانە دەخوارد. ئەویش نانی نیوەڕۆی لە گیرفانیدا بوو. کەوشی لاستیك، خەتێکی سووری ناشیرنی لەسەر پەنجەی پێی کێشابوو، شوێنی برینێکی بەجێ هێشتبوو، دەرسەکانی باش دەخوێند، لە ئاواڵەکانی زووتر دەچۆ پێش، دەیتوانی خەتە درشتەکانی ڕۆژنامەکان بخوێنێتەوە.

زستانی ئەو ساڵە، لە ساڵەکانی دیکە ساردتر بوو، پەنجەرەکانمان بە ڕۆژنامەو مقەبا، باش گرتبوو. ڕۆژێکیان بەیانی، منداڵەکانم بەسەر دەکردەوە:

«نیازعەلی نەدار".چەند کەس لە منداڵەکان، بەسپایی گوتیان: "نییە".

ڕاچەنیم، جێگاکەی بەتاڵ بوو، پەژارەیەکی نامۆ، لە ڕوخساری منداڵەکاندا دیار بوو. هەموان سەریان داخستبوو، هۆیەکەم لە ئەکبەری چاودێری پۆلەکە پرسی، گوتی:

«مامۆستا، دوێنێ ئێوارێ مرد لە سەرمان، مامۆستا، خوێن لە گەرووی هاتو مرد، هەر دەیگوت: ئەستێرەم دەوێ، ئەستێرەم دەوێ، ئەستێرەیەکی جوان بۆ دایکم".

منداڵەکان بێدەنگ بوون.. با، ڕۆژنامەی سەرپەنجەرەی پۆلەکەمانی ڕادەوەشاندو دەنگێکی لێوە دەهات، وەك ئەوە دەچوو، کە نیازعەلی لە دوورەوە چیرۆك بگێڕێتەوە، یان باسی خەونەکانی بکا، دەنگی ئەو وەختانەی کە ڕۆژنامەی دەخوێندەوە، لە گوێمدا دەزرنگایەوە.

پەڵەهەورێکی ڕەش، بە بەری ئاسمانەوە نووسابوو، هەمووومان بێدەنگ بووین، چاوم بە ڕۆژنامەیەکی تازە کەوت، کە بە پەنجەرەکەوە درابوو، بە خەتی درشت نووسیبووی:

«لەشساغی بۆ هەموان».

کۆمەڵە چیرۆکی "هەتاو" لە نووسینی نووسەری کورد: عەلی ئەشرەف دەروێشیانو وەرگێڕانی: عەبدوڵلای حەسەنزادەیە.

دەروێشیان هەرچەندە کوردەو خەڵکی شاری کرماشانە، بەڵام چیرۆکەکانی بە زمانی فارسی نووسیون.

چیرۆکەکانی گوزارش لە ژیانی ڕاستەقیەنی خەڵکانی هەژارو نەداری نێو کۆمەڵگای کوردەواری دەکەن، کە ئەو سەردەمە، زۆرینەی دانیشتووانیان پێك دێنا.

نووسینەکانی، ئاوێنەی باڵانوێنی ژیانی نێو کۆمەڵی کوردەوارین، وەکوو حەسەنزادە وەسفی دەکات.

ئەم کتێبە، ساڵی ١٩٩٠ لە بەغدا چاپ کراوەو منیش لە ١٩٩٢/٢/٨دا لە سلێمانی کڕیومەو خوێندوومەتەوە.

دڵنیام چێژ لە خوێندنەوەی وەردەگرنو بە زمانێکی زۆر کاریگەرو گوزارشێکی زۆر هەستیارو عاتیفیو ناخهەژێن، ئاشنا دەبن!

لە لای من، یەکێکە لەو کتێبانەی کە هەرگیز لەیادم ناچن.

هیودارم بەدەستی بخەنو بیخوێننەوە.

-هەر شاد بن-